


# تەفسیری کوردی

## لە کەلامی خوداوەندی

مەلای گەورە
( مەلا محمدی کۆیی )

بەرگی حەوتەم

# تەفسیری کوردی

## لە کەلامی خوداوەندی

مەلای گەورە

( مەلا محمدی کۆیی )

بەرگی حەوتەم

**جوزئی ( ١٩-٢٠-٢١ )**

**لەسەر ئەرکی بەڕێز مام جەلال سەرۆک کۆماری عێراقی فیدراڵ لەچاپدراوە**



## سورەتی (الفرقان)
### لە ئایەتی .... تا کۆتایی

﴿وَقَالَ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءَنَا﴾ أملیان نیە ئارەزویی ناکەن، خوفی خوایان نیە. ﴿لَوْلاَ أُنزِلَ عَلَيْنَا الْمَلاَئِكَةُ﴾ بۆ بۆوی دێن؟ بابشێنە سەر ئێمە، رأساً بێن! یا ملائکە بە رِسالەت بنێردرێن! ﴿أَوْ نَرَى رَبَّنَا﴾ ببینین، لە شك و شبە نجاتمان ئەبێ. نازانم خوای چۆن خیالْ ئەکەن؟ ئەگەر ببینن، بزانن خوایە؟! وکذا مَلَك چ معارفەکیان هەیە، تا بیناسن و بیناسنەوە؟ ﴿لَقَدْ اسْتَكْبَرُوا فِي أَنفُسِهِمْ﴾ نفسی خۆیان بە گەورە زانیە، أنانیّەتی نفسی قبولْ ناکا إیمان بە إنسان بێنن، ئەبێ ملائکە بۆ وان بێ! یا حضرەتی کبریائی خۆیان نیشان بدا! أما جهەتی گەورەییان نیە! ئەگەر بنۆڕنە أحوالاتی دنیّەی نفسیّی خۆیان، ئەزانن أدنی إنسانێ هۆشیار ئەتوانێ بیانی سوّی أعمال وآدابیان بکا، نوعاً ما رِێی باشیان نیشان بدا. ﴿وَعَتَوْا عُتُوًّا كَبِيرًا﴾ تجاوزێ گەورە بالغ النهایە. أساتذەی ئێمە هەرچەند ئەڵێن لە قیامەت خوا ئەبینن، أمّا متفقین دیتنی بە حالّی ئێستا نیە! ئەو رؤیتە کە لە دونیا بە چاو ئەبێ، وەبەو شرائطە کە علمای حکمة ذکریان کردیە، لەگەلْ معتزلی متفقین، ئەلێین: محالە! أما ئەوانەی تمثیلی خوا ئەکەن لە أربابی کشف وەکی مجسّمان، پەکیان ناکەوێ! بلێم چی؟ أربابی کشف ئەوەی بیلێن دەیلێن! ئەوی لە أوصافی إلاهی شتێ بزانێ وەبلێ خوا فوق الطبیعة، ئەو هذیانە ناکا، وە ئەزانێ بەو نوعەی حیوان یەك ئەبینن، خوا نادیترێ! وەبەو نوعەش خوا شتی نابینێ! ئەوە رُئیەتێ ترە! ﴿يَوْمَ يَرَوْنَ الْمَلاَئِكَةَ﴾ هەر رِۆژێ بێ! خوا قسەی لێ ناکرێ! ﴿لاَ بُشْرَى

يَوْمَئِذٍ لِلْمُجْرِمِينَ﴾ بۆ وانه مزگێنیان لێ نەبێ. ﴿وَيَقُولُونَ﴾ خۆیان ئەڵێن ﴿حِجْرًا مَحْجُورًا﴾ پەردەیّ حجابی، حائلی بمانشارێتەوە لەوانە. موصلّی کە مکروهێ ببینن ئەڵێن: یاستّار، یاستّار! ﴿وَقَدِمْنَا﴾ قصدو ملاحظه مان کردوه ﴿إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ﴾ ئی چاکەیان ﴿فَجَعَلْنَاهُ﴾ يومَ القيامة. ﴿هَبَاءً﴾ تۆزێ ﴿مَنْثُورًا﴾ بڵاوکراوە، بوجه من الوجوه، بەکاریان نایە! ئەڵێن: (تَلَعفري) لەو خۆڵێ بارانی ئەبێ، تۆزەکەی ئەگرن، بە دەرمانی چاو إستعمالی ئەکەن، گۆییا بەرەکەتە لە ئاسمانێ هاتیتە خوار. ئەوانە ئەوندەدە خێرەش لە عملی خۆیان نابینن! وەقسمێ ئەڵێن ضمیری (يقولون) بۆ ملائکەتیە- ئەڵێن: بشارەت لە ئێوە حرامە، ئەوە مختاری (ابن جرير)ە! ﴿أَصْحَابُ الْجَنَّةِ﴾ مؤمن. ﴿يَوْمَئِذٍ﴾ ئەوێ رۆژێ. ﴿خَيْرٌ مُسْتَقَرًّا﴾ وەك (نادى)، مکانێ بۆ أنس محادثە داندرابێ ﴿وَأَحْسَنُ مَقِيلًا﴾ جێی إستراحەت وخەوی پێش إستوا!. هەرچەند مترفهینی دونیا مجلس و مقیلیان زۆر خۆشە، خصوص لەو زەمانە، بنۆڕە مقیلی نجومی سینەمائی سەرت سوڕئەمێنێ! أمّا مستقّر ومقیلی أهلی جَنّه، قیاس قبوڵ ناکا! ﴿وَيَوْمَ تَشَقَّقُ السَّمَاءُ بِالْغَمَامِ﴾ یعنی ئاسمان، أجرامی عُلویّه قویّە، بێ هێز ئەبن، تماسك وتجاذُبیان زۆر کەم ئەبێ! هەورێ پێیدا دێ شەقّی ئەکا، وەك بە هەوادا بڕوا وایە! إنشقاقی ئاسمان وله باڵ یەك هاتنەدەریان، (مِلیّون) إنکاری ناکەن! وەحکمای قدیمی یۆنانی إنکاری ئەکەن! وەئەڵێن: (ئاسمان قبوڵی خرق و إلتیام ناکات، وەکی أرض وەهەوا نیە! لەبەر چی وا ئەڵێن؟ لەبەر مَحَدِّد الجهاتْ! چونکی جهەتی حقیقی طبیعی، فَوق وتَحت تعینی بە فَلَك الأفلاك ئەکرێ! نابێ حرکەی مستقیمی ببێ، زێرا حرکەی مستقیم إلی الجهه، حرکەی مُحَدِّد إلى الجِهة، مَحاله!) گەلێ مسائل هەیە فرعی مسألەی تحدیدی جهاتە! تا أصل إبطال نەکرێ إنکاری فرع ناکرێ! ئەگەر بکرێ ئەبێتە عناد!. حُکمای حاضر ئەڵێن: جسمێ هکذای لە هەموو طرفْ إحاطەی أرض وسائری أجرام بدا، نیە! ئەو أرضە لە وَسَطی کائنات داندراوە، تا تحت بە مرکزی وی قائم بێ! ئەویتر فضایە، پان ودرێژە، چەند منظومەی تیایە، کە هەر کوڕەیێ

فوق وتحتی خۆی تعین ئەکا بە قووەی جاذبە! ﴿وَنُزِّلَ الْمَلَائِكَةُ تَنزِيلاً﴾ لە مەیانی غمام دێنە خوارێ، یا لە خۆوە، یا لەخواوە، یا ئەنێردرێتە سەر عەردی، بۆ خزمەت ئەوزەواتی مستکبرینی کە ئەیانەوێ ملائکە بێنە خزمەتیان، یا زاتێ أقدسی کبریائی ببینن!. قرائاتی مختلفە لێرە زۆرە، (١٠) دە قرائتە! واچاکە إنسان تەماشای معنا بکات. ﴿الْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ الْحَقُّ لِلرَّحْمَانِ﴾ (ملك)ێ (لایزال) و (ثابت) و (مقرّر) بۆ وی یە. (عنوان)ی (رەحمەت) لە (وقت)ی (غضب) دەری ئومێد ئەکاتەوە، بۆ (قاصر)آن ﴿وَكَانَ يَوْمًا عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ (عام) (خصوصاً) (مقترح)ەکان ﴿عَسِيرًا﴾ شدید و ناخۆش چی ئەخواست وچی دیت؟! ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ﴾ بەهەردوو دەستی خۆی دا دەنووسێ، ئەی گەزی، لە (حسرەت) و (ندامەت) ﴿يَقُولُ يَالَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلاً﴾ خۆزی سەد بریا، بە (إتّباع)ی ئەو، رێی (حق)م گرتبا، پێیدا رۆیبام. دیارە (إیمان)ی سەرزارەکی، پەیرەوی تیا نیە ﴿يَاوَيْلَتِى﴾ خانە خوشتووری خۆی ﴿لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلاَنًا خَلِيلاً﴾ بە دۆستم نەگرتبا، برادەریم لەگەڵ کرد، دوای کەوتم، بۆ (خێر)و (برکەت)، (أمّا) (مع الأسف) خۆی نەبوو ﴿لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنْ الذِّكْرِ﴾ لە (قرآن)، کتابی خوای ﴿بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي﴾ خۆی بۆم هات، (قریب الوصول والحصول) ﴿وَكَانَ الشَّيْطَانُ﴾ (أوّل)ی بە (خلیل)ی گرت، (أمّا) لێ ی بوە (شیطان)ی (رجیم)، دوور لە (رەحمەت) ﴿لِلْإِنسَانِ﴾ دۆستی خۆی ﴿خَذُولاً﴾ گەلێ ئومێدی پێم دا، (وسوسە)ی خستە دڵم، ئەمە خۆی نیە، (شبهات)ی هێنا، چۆن (إنسان) زیندی ئەبێتەوە؟ لە (وەقت)ی لێ قەومان (ترك)ی کردم، بێ کەس ودەرەتان ﴿وَقَالَ الرَّسُولُ﴾ لە (دار)ی (دنیا)، ئەفەرموون: "(عطف)ە، لەسەر (وقالَ الذينَ لا يَرجونَ لِقاءنا)ی" ﴿يَارَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَذَا الْقُرْآنَ﴾ (نور)ی (هدایەت)، مایەی (سعادەت) ﴿مَهْجُورًا﴾ (متروك) (إهتدا)ی پێ ناکەن، (یاأیّها الرسول) ئەمرۆ بنۆرە قومت (أمّەت)ی (إجاب)ە، کە إیمانیان بە (رسالەت)ی تۆو (حقیقەت)ی (قورآن) هەیە کوو ڕوویان لێ وەرگێڕایە؟

(خصوص) لە (أحكام)ى (سورە)ى (نور)، كەسێ بنۆڕێتە (حالْ)ى (أمّەت) و (آداب)و (فـضائل)و (شـرف) و(نـاموس)و (حكمـت)و (مجـد)ى (قـورآن)ى و(خيالْ) ئەكا، ئەو (أمّەت)ە (طول)ى (عمر)ى گوێى لە قرآن نەبوە، نازانـێ چ ئەفەرموێ؟! وەياخود ئەڵێ: "(رَغماً للقرآن) ئـەو هـەموو (مـآثر)ەيـان (تـرك) كرديـە، بـەو (وقـايع) و (قبـايح)ە، (متلـذذ) بـووين. (مـع الأسـف) (قـوم)ى (نجيـب)ى (عـرب) نـەبوو، (إصـلاح)ى (قلـب) نـەبوو، (إصلاح)ى زوبـان ڕووى تێناكەن. أدبايان (ممكن)يان بێ، حروفى عربى ئەكەنە لاتينى، لسانى ڕەسمـى و تعليمى ئەكەنە (لسان)ى (عوام) ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ﴾ (تَـسَلّا)يـە بـۆ پێغەمبـەر، بـەڵێ ئەمـە (قابـل)ى (تـسلاّ)يـە (مدافعـە)ى (عـدو) دەكرێ، (أمّـا) (مدافعـە)ى دۆسـت (مـشكلە)يـە، نـاكرێ، چـارە چيـە؟ ئـەمڕۆ (سوادى أعظم) لە (أمّەت) (عدوّ)ى (دين)ە، (دين) بە (مانع)ى (ترقى) ئـەزانن، (أكثر)يان لە (فرنسا) ڕقيان پتر لە (قران) دەبێتەوە. ڕووى (قلب) و (قالب)يان لە (أوروپا)يە (أروپا)ش بۆ (إنسانيەت) و (فضائل) و (وفا) و(حسن)ى (آداب) و (وقـار)و (حفـظ)ى (عهـد)و (جـوار)، ئـەو (غـرض)ى كـە هەيـەتى (عـلاوە)ى (قوميـەت)و (إسـتكراە)ى (عناصـر)ى (مختلفـە)، ئـەوجا چـارەيە نيـە، (إلاّ) (قهر)ى خوا، بۆ (ئاوروپا) وە(إمـداد)ى خـوا بـۆ (بعـض)ە (عبـاد)ى (مـصلح)و خێـر خـواهى (أمّـەت)، بـێ (ميـل)و (محابـا)و (تفريـق) ﴿وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا﴾ خوايە خۆت ئەزانى ئەگەر شـتێ نـەنوێنى، چـەرخى (دوور)و (دولاّب) نـەگۆڕێ (عـن قريـب بالكليـە) (ديانـەت) نـامێنێ، وە(قـورآن) (بـالمرّة) (تـرك) ئـەكرێ (عمـل)ى پـێ نـاكرێ! ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەوانـە هەرنـە (إسـە)، (جاهل)ن يا (عنود)ن ئەگەر (يهود) بن (لاشك)لە (حماقەت)ەوە ئـەڵێن: ﴿لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً﴾ هـەمووى بـە جـارێ (نـازل) بوويـا، ئـەو وەقتـى كەس نەى دەگوت:" (إفك)ە، (أعانه آخرون) و (تُلِيَ عَلَيْهِ) يە" تۆ بە (تقليد)نا بـە چـاوى تـێ گەيـشتن بنـۆڕە، (كتـب) ى (أحكـام) و (آداب) و (سياسـەت) و (سلم) و (حروب) و (تهذيب) و (تدبير المنزل) (يعنى) (كتێب)ى وەكى (تـورات)

بۆ (مثل) ی (موسی) (قورآن) بۆ (مثل)ی (محمد)، کوو (جُملةً واحدةً) (نازِل) ئەبێ؟ نازانم (إنجیل)) (أصل)ی چ بووە؟ چی تیابووە؟ ئەگەر (شبیه) ی (قورآن) و (تورات)بێ، (ممکن) نیه (جُملةً واحدةً) (نزول) بکات، ئەگەر وەك ئەو (إنجیل)انە بێ، کە دوایە (تألیف) کرایە، (ممکن)ە (تأریخ)ی شەش هەزار ساڵی بکرێتە یەك (کتاب)، (تقدیم)ی (ذات)یَ بکرێ.

لام وایە ئەگەر (قائل) (یهود)بێ (مقصد)ی (تبدیل)ی (قورآن). وەکی (أسکندەرنامە) و (شەهنامە) و بعضێ. (مباحث) ی (ملحق)ی (تورات) ﴿كَذَٰلِكَ﴾ وامان (نازل) کردیە ﴿لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ﴾ (لدی الإیجاب) (آیەت) ئەنێرێ لە دڵی (رسالەت) پەناە (قرار) گیرو بە (قوەت) و (ترقّی) ئەکا، بۆ (إستنساخ) و (إستنباط) وە (أمین) ئەبێ لە (تحریف)، وە (مُتَفَرِّقاً) (حفظ)ی (أسهل) و (أشمل)ە ﴿وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلاً﴾ ئەمە (فوق الکل)ە. هەروەها جاری (جنابی حق) (بالذات) (بعضاً) (جبرائیل) (آیەت، آیەت) بەسەریا ئەخوێنێتەوە، بە (تلاوەت)ی (جیب). کووا ئەو (حضور)ە، ئەو (ربط)ە (دائمیە) لە(نزول)ی (جُمْلَةً وَاحِدَةً)؟ (قورآن) بۆیە (محفوظ) بوو، لە (تحریف) و (تبدیل)، (آیەت)یَ (نازل) ئەبوو (علی مَلَأِ الناس) (تلاوەت) ئەکرا،(مؤمن) و (کافر) ئەیزانی، وە (ممکن) بوو، (کافر)ەکانیش بێتە بەریان (وعلاوة) غرابەتی نظمی تدوینی، مخالف لەگەڵ نظمی نزولی. حاصڵی ئەو قسەیان، یا لە (جهل)ی بێ (محاکمە) و لێکدانەوەیە یا لە (نفاق) و (شیطنەت)ە. بەڵێ گەلێ قسە هەن، (ولو) پیاوی گەورەش (نقل)ی کەن، (أما) (نقد)ی ئەوێ، (مثلا) ئەڵێن:" (أدیب)ی (بلیغ) (کاتب)ی (قدیر) و (ماهر) و (باهر)، (تصدّ)ی کردیە، بۆ (معارضە)ی (قورآن)، تا گەیشتیتە (آیە)ی (یا أرضُ إبلعي ماءكِ..ألخ) ئەوجا زانیویەتی (معارضە) ناکرێ، ئەو (حکایەت)ە لە (نقد) دەرناچێ. ئەگەر تێ (فکر)ی بە (خیال) ئەزانی، ئەوەی (قصد)ی (معارضە)ی (قورآن) ئەکا، ئەبێ کوو بکا؟ (أولاً): خۆی (فرض) کا بە (صاحب)ی (دعوة)یَ، (ولو) بۆ (سیارەت) و (تجارەت)ی، (إبتداءً) (ضعیف) و بێ (معاون) و (معذب) و (مهان)و (محقر)و (مبغوض)و

(مستکرە) ئەبێ، جا (دوام) لەسەر (دعوة) کا، وردە وردە (معاون) بۆ ببێ، بابکەوێتە (حال)ێ زۆر ناخۆش و مجبور بێ (ترک)ی ئەو وڵاتە بکا، لە (مملکەت)ێ دی (معاون)ی باش دەست کەوێ، لە مەیاندا، (جمع)ی هەبن، (ظاهر)و (باطن)یان یەك نەبێ، خەریکی ئیش تێکدانی بن، لەو (بین)ە باز (سعی) کا، بۆ (دفعی) (أعدا)ی (سابق)و (منافقەکان)ی (لاحق) (حسب الوقایع المخیّلە) (جملە)دانی، تا بەسەر ئەکەوێ (أساس)ی دادەمەزرێنی، ئەوجا (أوراق)ی پەرێشانی کۆکاتەوە، بیکا بە (کتێب)ێ (بلیغ)، (منتظم)، پڕ لە (تدبیر)و (حکم) بڵێ: "من بەو (کتاب)ە (معارضەی) (قورآن) ئەکەم، ئەوهائەبێ، قوریان ﴿وَلاَ يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ﴾ کلامێ غریب وعجیب، وەك أمثال و مەتەڵۆکە. ﴿إِلاَّ جِئْنَاكَ﴾ لە مقابلی وان ﴿بِالْحَقِّ﴾ بە جەوابێ حق وثابت ومُقَرَّرو حاسم وقاطع. ﴿وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا﴾ بیان و کشفێ لە غایەت حسن. بێ شکم هەر سؤال وإقتراحەکی کردبیان، جەنابی حەق بێ تأخیر وحی بۆ ناردیە، بەڵکو گەلێ جار لە مسائلی زۆر مهم، پێشین فەرموویەتی: سؤالت لێ ئەکەن، ئەمە جەوابیە! چۆن تأخیری ئەکا؟ قابلە رسولی خۆی بکاتە ڕیش خەندەی أعداء؟ حاشا ثم حاشا! ﴿الَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَى وُجُوهِهِمْ﴾ لەسەر ڕوو، ڕایان ئەکێشێ ﴿إِلَى جَهَنَّمَ﴾ خوا حفظمان بکات. ﴿أُوْلَئِكَ شَرٌّ مَكَانًا﴾ نظریە سائری جَهَنَّمیان. ﴿وَأَضَلُّ سَبِيلاً﴾ بۆیە معکوساً ئەیانبەن بۆ جهنّم. ئەوانە مستەکبرەکانی، لووت بڵند، خود پەسەند، مُتَفَرِّدو مُسْتَبِدِّی بالرأین! ئەوانەی کە سعی ئەکەن بۆ قەلب و وەرگێڕانی قرآن صرفی عباد ئەکەن لە توجّە بۆ طرفی قرآن ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ﴾ بە مُنَجّمی وەکی قرآن، تأریخ ومأریخ مُلحقاتە! ﴿وَجَعَلْنَا مَعَهُ أَخَاهُ هَارُونَ وَزِيرًا﴾ إیجابةً لدعاهُ (وأجعلْ لي وَزيراً من أهلي). ﴿فَقُلْنَا اذْهَبَا﴾ هەردووکتان. ﴿إِلَى الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا﴾ آیاتی کَوْنی. عبارەت صریحە کە مراد آیاتی (موسی) نیە، ئەوانی بعد الإرسال بوون! تأویل چ لزومی نیە! بەڵێ ئەگەر بە طریقی مقبول لە رسول منقول بێ، مجبوراً تأویلێکی بۆ ئەکەین! چوون، ئەوجا (کذّبوا بآیاته التّسع). ﴿فَدَمَّرْنَاهُمْ تَدْمِيرًا﴾

تێکمان دان، وردمان کردن ئەڵێن (إمامی علی) (قَدَ مّراهم)ی خوندیتەوە، أنّە جنابی حەق أمری دایە جووتەی برایان، ئەو قومە، بە هیلاك ببەن! هەرچەند لە بطشی (موسی) وصَوْلَتی (حَیْدَری) ئەوەشێتەوە، بەلاّم بە هیلاك چوونی قومی (فرعون)هەندە هاسان نیە!!! بە قووەت وقدرەتی قاهری کبریائی شکان ویە هیلاك چوون! ﴿وَقَوْمَ نُوحٍ لَمَّا كَذَّبُوا الرُّسُلَ﴾ أنّە إنکاری رسالەت ئەکەن! ﴿أَغْرَقْنَاهُمْ﴾ بە طوفان. ﴿وَجَعَلْنَاهُمْ لِلنَّاسِ آيَةً﴾ مشاهدةً یا بە سماع، زاتاً قصّەی نوح هەمووی آیات وعبرە! ﴿وَأَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ﴾ عام. ﴿عَذَابًا أَلِيمًا﴾ دونیوی أُخروی. ﴿وَعَادًا وَثَمُودَ﴾ مَعلومن. ﴿وَأَصْحَابَ الرَّسِّ﴾ خلافیە! ﴿وَقُرُونًا بَيْنَ ذَلِكَ﴾ لە بەینی (ما ذکر) ﴿كَثِيرًا﴾ زۆر لأیُعد! خوانەبێ کەس أحوالیان نازانێ، وەلە ذکریان چ فائدەێ وانیە، وحی دەرحەق نازلّ بێ! ﴿وَكُلاًّ﴾ لەو أممانە، ئەو قرونانە! هەر قەومە رسولی خوای بۆ چووە، (دَعوة إلی الحَقیان)ی فەرمووە! ﴿ضَرَبْنَا لَهُ الأَمْثَالَ﴾ أحوالی أممی سابقە، سببی هیلاکیان، نجاتی مؤمنیان. ﴿وَكُلاًّ﴾ لەوانی إیمانیان نەهێنا. ﴿تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا﴾ پارچە پارچەمان کردن بە هیلاکمان بردن. ﴿وَلَقَدْ أَتَوْا﴾ قومی تۆ، ساداتی قریش! ﴿عَلَى الْقَرْيَةِ الَّتِي أُمْطِرَتْ مَطَرَ السَّوْءِ﴾ (سدومی أعظم) قرای قومی (لوط)، کە ژێر بەرەو ژووری کرد، بەردی بەسەردا باراند. ﴿أَفَلَمْ يَكُونُوا يَرَوْنَهَا﴾ گەلێ کەس بە مواقعی غریب غریب دادەڕوا، وەکی حیوانات بە دقّة نایتۆڕێتێ، زۆر مناظری طبیعی أهلی نظرو عِبَر ڕائەگرێ مستغرق ومتحیّر ئەبن لە بدایع، بینما جمعێ پێدا ئەڕۆن بێ تَأمّل وتَفَكُر! وادێتە بەر نظر جەنابی رسالەت پەناه هەرچی کەوتبێتە بەر نَظَری، حکمەتێ، آیەتێ، عبرەتێکی لێ وەرگرتیە! لە هەموو شت جهەتی حُسْنُ وخیری ملاحظە فەرمووە، حتّا مسألەی إفك خوا ئەفەرموێ بە خیری حساب بکە! ﴿بَلْ كَانُوا لاَ يَرْجُونَ نُشُورًا﴾ بۆیە متأمّل مُتَفَكّر نەبووین، سطحیّاً تەماشای ئەکەن! وردی لە عاقبەتی ئەندێشەیە! ﴿وَإِذَا رَأَوْكَ إِنْ يَتَّخِذُونَكَ إِلاَّ هُزُوًا﴾ هەر بە قشمەر جارێ ئەگرن! إتباعی چی؟ بە کمالی إستحقار ئەڵێن: ﴿أَهَذَا الَّذِي بَعَثَ اللَّهُ رَسُولاً﴾

ئه‌مه‌یه خوا به په‌یامبه‌ری هه‌ناردووه؟ ﴿إِنْ كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ آلِهَتِنَا﴾ نێزیك بوو وه‌رمان گێڕێ له آلهه‌کانمان ﴿لَوْلاَ أَنْ صَبَرْنَا عَلَيْهَا﴾ له‌سه‌ر عباده‌تی آلهـه‌کان، چاك بوو خۆمان گرت به به‌ییناتی ساحرانه‌ی هه‌ڵنه‌خه‌ڵه‌تاین! وه‌إلاّ گومڕاه ئه‌بووین! ﴿وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ الْعَذَابَ﴾ که‌ی؟ له دونیا؟ له عقبا؟ ﴿مَنْ أَضَلُّ سَبِيلاً﴾ معلومیان ئه‌بێ إلاهه‌کانیان بۆفن چییان پێ ناکرێ! ئه‌و میل و محبّه‌ته ئیش منداڵیه وه‌کی شیعان به منداڵی بُغْضی (عُمَر) ئه‌هاوێنه ده‌ماغی منداڵان دوایی ئه‌شخوێنن تأریخ ئه‌زانن، اْلآن کانَ کَما کان!

﴿أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ﴾ (إله)ێ (عباده‌ت) ناکا له (علم)و (عقل)ه‌وه بێ، بەڵکو له (هوای) (نفس)و (میل)ی (کاذب)ه. گاجووت چۆن ئه‌په‌رستریّ؟ به چ خیاڵێ؟ به چ فکرێ؟ صنمێ له‌به‌ر چاوی دائه‌تراشێ، ئه‌ی باته‌وه ماڵێ، (عباده‌ت)ی ئه‌کا، له‌سه‌ر چی؟ له‌به‌رچی؟ به‌س هه‌واو میل نیه؟ ئه‌و (میل)ه کوو (زائل) ئه‌بێ؟ زۆر (زه‌حمه‌ت)ه. دوێنێ شه‌وێ ئێکی گێڕایه‌وه: (أسیر) بوه، له‌لای (هندستان)، (جمع)ه‌کی گاپه‌رستان، له شووشه‌یه گوساله‌کیان لابوو، (عباده‌ت)یان ئه‌کرد، یه‌کی له (مُسلّمان)آن، به دزی ئه‌ی هاوێته ناو (خلا)، سبه‌ی ئه‌نۆڕن نه‌مایه، دوایه ئه‌ی دۆزنه‌وه له (مقام)ی (معبودی) هاویشترایته (قدمخان)ه، (ومع هذا) باز (کما کان) (تقدیس)ی ئه‌که‌ن. ئیتر چاره؟ (وهکذا) (عباده‌ت)ی (قوم)ێ له‌مه، بۆ (مُتَشَيِّخ)آن، (عین)ی گاو که‌ر په‌رستیه، (میل)یکه تێیاندا په‌یابووه، ئه‌وی ئه‌و ناوه‌ی لێ بێ لایان خوایه، (حاكمٌ عَلى الله)یه ﴿أَفَأَنْتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلاً﴾ (حفظ)ی ئه‌که‌ی له‌و (نوع)ه (دنائه‌ت)ه؟ (هدایه‌ت)ی ئه‌ده‌ی؟ (خێر)! (أمّا) ئه‌وه‌ی (هوا)ی خۆی ئه‌کاته (إله)ی خۆی ئه‌وه (بولهوه‌س)ه، (ممکن)ه (هوه‌س)ی بێته‌سه‌ر (هدایه‌ت) آیا لات وایه ئه‌وانه چاره ئه‌کرێن؟ ﴿أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ﴾ گوێیان هه‌یه، (أمّا) (سمع)یان نیه. (قلب)ی (جوفا)یان هه‌یه، (فارغ) له تێ گه‌یشتنه ده‌ماغیان پڕ بووه له (وهم) و (خیاڵ)ی (فاسد) ﴿إِنْ هُمْ إِلاَّ كَالأَنْعَامِ﴾ ئه‌وانی به (ذکا)نا، ئه‌وانی ته‌په حۆڵه‌یی هێسك گرانی، گێل وێل

﴿بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلاً﴾ لە (أنعام) ئەوان هەر نە ئیسە، ئەو شتەی ئەکەن بە (عزین)ە کە (خێر)ی خۆیان تیا بێ، ئەوانە ئەوەندەش ناکەن، کەسێ (سجد)ە بۆ (صنم) ببا، دیارە لە هەرچی ذی (حیات) بێ —حتی لە نباتات— دون ترە. (عجاییات)ی (بشر) (تحریر) ناکرێ، یەکی (دعوا)ی خوایەتی ئەکا، یەکی بەسەی ئەڵێ: "(هذا ربّی)" لای خۆی (عارف)ی (بالله)یە ! (حیوانات)تیش ئەوەی بە (غریزە) ئەیکات زۆر (غریب)ە، لەوی بترازێ، هیچ سەرگەردان، ڕێ بە چ نەبەرە. بنۆڕە مێش ئەنگوێنە، چ (صنعەت)ێ ئەکا، ئەبینێ ئەکەوێتە ناو (حوض)، (بین)ی دو ئەنگوستە، بۆ کەناری، (شعور)ی نیە، بێ بۆ کناری (حوض)و (نجات)ی بێ ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ (أيّها الرسول)، (کما علیە الجمهور)، (أمّا) من لام وایە بۆ (رائی)یە، وە مقصد تعریض بێ، بۆ ئەو بێ چاو و ڕووانە، بۆیە (إلی) ئەفەرموێ، ناڵێ (ربّك)، ئایا نگاهێ ناکەی، بۆلای خوای؟ لە (آثار)ی (فکر)ی، (حتّی) (أظهر)ی (أشیا)یان، ﴿كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ﴾ چ نەبێ بنۆڕە سێبەری خۆت کە (دائم) لەگەڵتە، نسەی ئێوارە و سایەی سبەینان، یا(شبە)ی (ظل)ی سەر (أرض)ی (بَین)ە بەیان و ڕۆژ هەلاتن، (حقیقة) ئەو (وەقت)ە بە (بدأ)ی (حیات) ئەچێ لە خۆش. (أمّا) (ظلّ)ی (بدأ)ی (خلق) گۆی یا، ئاسمان وەکی (قبّە) لەسەر عەرد بڵند کرایە، بێ (نور)و (ضیاء)، سێبەری هاتیتە سەر عەردی، بە (خیاڵ) نەبێ کەس نەیدیوە کەس (علم)ی پێ نەبوە، نازانم (زمخشری) لە کوێ هینایە، ئەو (تصویر)و (تصوّر)ەی کردیە؟ لەبەر (ثم)ەی دوایە، ئەو (ترتیب)ەی داوە ﴿وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا﴾ (حرکەت)ی سێبەر (تابع)ی (حرکە)ی (ذی نور)ە، ئەو ڕاوەستی؛ سێبەریش (ساکن) ئەبێ ﴿ثُمَّ﴾ (لازم) نیە بۆ (ترتیب)ی (زمانی) بێ ﴿جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلاً﴾ چ (ظلّ)ی (أرض)ی، چ ئەوەی نەختێ بڵند بێ لەسەر (أرض)ی، (معکوسا) (تابع)ی ئەوە. (شمس) (مرتفع) بێ، سێبەری (أشیاء) کورتە، نەوی بێ، سێبەر درێژە. ئەو (آیة)ە ئەو (ظل)ە (مفتاح)ە بۆ (علم)ی (عظیم)، بە (خیاڵ)ی (صائب) ئەتوانی (أحواڵ)ی (قطعات)ی (أرض)، (نسبەت) بە (وضع)ی لەگەڵ (شمس)

بزانی. ئـەو (ظـل)ەیـە چـەند (دقـائق)ی (علـم)ی (هەیئـەت)ی دوور خـست بـۆ (سمت القبلە). ئەو (ظل)ە بوو، (کشف)ی مانگ و ڕۆژگیرانی کرد ﴿ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا﴾ سبەینان سێبەر درێژە، ڕۆژ بڵند ئەبێ، ئەو کورت ئەبێ، تا دێتە (خطّ)ی (نصف النهار) (ظلّ)ی (ممدود) نامینێ، ئەگەر ڕۆژ بکەوێتە سـەر سەر (بَعْدَهُ) (شمس) لۆلای (مغرب) نەوی دەبێ، سێبەر بـۆلای (شـرق) (تمـدّد) ئەکات، تا ئاوا ئەبێ، ئەویش تەواو ئەبێ (أمّا) (قبض)ی ڕۆژی (قیامـەت) لێـرە جێی نیە، هەرچەند (علَلْ)ی (ظاهری) (مَدّ)و (جَزر)ی (ظـل) دیـارە، (أمّـا) بـە (نظر)ی (إعتبار) تەماشای کەی، ئەزانی ئـەو (صـنع)ە (بـدیع)ە ئـەو (تریـب)ە (عجیب)ە، بێ (صانع)ێ (علیم) و (قدیر) ناکرێ! ڕۆژ لـەو(مـسافە) دوورە، بـە (لمحە)یە (نور)ی ئەگاتە سەر (عەرد)ی، (أمّـا) لەپـەلکی مێـوی (مـثلاً) (نُفـوذ) ناکـا! ئەگـەر وەك (ڕۆنـتکین) (نفـوذ)ی کردبـا، (ظـل) نـەدەبوو، ئەگـەر عـەرد (کثیف) نەبا، ئەو (حِکَمُ)و (دقائق)ە دەرنەدەکـەوت! (خلاصـە) (ظـل) (آیـة)ی (عظیم)ە، (مفتاح)ە بۆ (علم)ی (نافع)، کـە (إنـسان) لـە گـەڵێ (کفـر)ی کەرانـە (نجاة) ئەدات ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ اللَّيْـلَ لِبَاسًـا وَالنَّـوْمَ سُـبَاتًا﴾ (مَـوت)ە أمّـا موتی ڕاحەت، بۆ إعادەی قوای بدن! بعضێ حکمای غرب ئەڵێن: موتی طبیعی ئەگەر ببێ، وەکی نوستنی شەو. ﴿وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُورًا﴾ کأنَّهُ زیندی ئەبنـەوە. لەبەر مقابلەی (ثبات) بە (نشور) (زُمَخشری) وەکـی خـۆی ئەفـەرموێ تفسیری (ثبات)ی بە (راحەت) نە کردیتـەوە. ئـەو (لیـل)و (نهـار) و (ثبـات)و (نـشور)ە، ثَمَرەی (نور)و (ظل)ە. ﴿وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَـاحَ بُـشْرًا بَـيْنَ يَـدَيْ رَحْمَتِـهِ﴾ ألآن ئەوا بای غربی دێت، هەورە، ئومێدی باران هەیە! ﴿وَأَنزَلْنَـا مِـنْ الـسَّمَاءِ﴾ بـالآ بڵندی هەور. ﴿مَاءً طَهُورًا﴾ صاف خاوێن. مەلایان شرعی تفـسیری ئەکـەن بـە پاك وپاك کەرەوە، مبالغەی في الطهارەت وایە ئەبێ وابێ! هەرچـی هـەبێ لێـرە باسی دەست نوێژ نیە! باسی منافعی طبیعـیـە. ﴿لِنُحْيِـيَ بِـهِ﴾ بـەڵێ (بِـهِ)! ﴿بَلْدَةً مَيْتًا﴾ هیشك بێ نبات! ﴿وَنُسْقِيَهُ﴾ ئاوەکە. ﴿مِمَّا خَلَقْنَا﴾ لـە زومـرەی مخلوقاتی خوای ﴿أَنْعَامًا﴾ أنعام، بـۆ إنسان، نفعـە! لـە سقی وی إدارەی وی

تیایە. ﴿وَأَنَاسِيَّ كَثِيرًا﴾ أهلی بادیە مدارایان لەسەر بارانە. ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَاهُ﴾ ئەمەیە تصریفی خوا! (ماء)ی منزل، ئاوی طهوری باران، بە گوێرەی أحوالْ و فصولْ وأوقات، تحویلی ئەکا. ﴿بَيْنَهُمْ﴾ لە بینی بشر. ئێستا لای ئێمە آخر مانگی زستانە وەقتی بەفروبارانە لە أمریکا آخر مانگی هاوینە گونگەری سەبزەو میوەجاتە! ﴿لِيَذَّكَّرُوا﴾ تَفَكُّرو إعتبار کەن! ئەگەر کەمێ علمی هیئەتیان زانیبا، تذکّریان ئەکرد! ﴿فَأَبَى أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا﴾ (سبحان الله) گەلێ لە أهلی علمیش لائەدەن لە ڕێ، أحوالاتی ڕاهینە ئەکەنە أعمالی طبیعة، بێ حاجە بۆ صانع ومدبّر! مؤمن ومەلای ڕاستی ئەوەیە هەم إلاهی هەم طبیعی بێ! قول بە طبیعەت و مدبّری طبیعەت بکات! ئەوا دیارە معمل ئیش ئەکا، أمّا بێ مُرَتِّب ئەبێ؟ حَقًّا طَرَفین تعدّا ئەکەن! کەسێ خۆی لە عقلْ نەکا، أثری علم ظاهرە، قابلی إنکار نیە! علم طبیعەت إستخدام ئەکات، طبیعەت طوعاً أو کرهاً خزمەت ئەبینێ! ﴿وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ﴾ لە عصْری توو. ﴿نَذِيرًا﴾ ئەما توو، مُقابِلی هەمووی کافی! بۆیی تووی گێڕاوە بە (نذیر)ی عالەم، إستغنای لە غیری تووی کردیە. ﴿فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ﴾ بە مداهەنەش. ﴿وَجَاهِدْهُمْ بِهِ﴾ بە قرآن کتابێ هادی لجمیع الأنام. حقّا کلی آیتی بۆ هدمی قلعەی کفر، لە دانەی طۆپی هاوەن بە قووەتترە! هەرچەند قووەتی طۆپ وطیّارەمان نەبوو، أمّا قووەتی (قرآن) الآنیش خۆی محافظە ئەکا! إنسانێ ئەوەی لە موقعی خۆی ڕوو لە هدف إستعمالی کا، ئەتوانێ بە (قرآن) لەگەلْ (أنام) جهاد بکا! ﴿جِهَادًا كَبِيرًا﴾ گەورە بەقەد هەموو أمم. (حقیقةً) جهادی بە قرآن کرد، موفّق بوو! ﴿وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ﴾ شیرین و سوور، ئەیانرِوێنی هەر یەك لە مجرایێ! ﴿هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ﴾ شیرین خۆشگوار. ﴿وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾ سوێر، گەرم، ناخۆش، وتالْ. ﴿وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا﴾ بەینی بەحرەین. ﴿بَرْزَخًا﴾ عەرەبیە؟ یاخود لە (برزە) وەرگیراوە؟ دوور نیە! خوا حاجزێکی هاویشتبێتە بەینیان، ناگەنە یەك تێکەلاو نابن! مع أنَّهُ ممکن بوو ڕوو لەیەك کەن ئەمە حائلی حسّی! ﴿وَحِجْرًا مَحْجُورًا﴾ نفرەتێ طبیعی، كَأَنَّهُ إستعاذة لێك ئەکەن!

ئـەوجا بـڕۆ تتبعـی أحـوالّی بحـار بكـە، عجـايبی صـنعی پـەروەردگار ببينـە! أسبابی ملوحەو تفت و تالّی ئاو معلومە، بە واسطەی بعـضیٚ عناصـرو ومـوادی خارجی ئەبیٚ! بەلاّم صـيانەتی ئـاوی فـرات وعـذب، علـم وقـدرەتی خـصوصی ئەویٚ! زێرا ئەو عناصرو موادەش مخلـوقی خوايـە، بـۆ لـەویٚ ئـەبیٚ؟ بـۆ لێـرە نابـیٚ؟ ميـاهی معـدنی دەردەقـولیٚ هەنـدیٚ عيـونی (كبريـت)ن، هەنـدیٚ (جبرن-قير)ن، عينی مائی كبريتی بعضەكی بعضەكی گـەرمن بعـضەكی ساردن. ئـاویٚ هەيە لەلای (صابلاغ) بابم چـوو بـووە تەماشـای، ظـاهراً ئـاویٚ صـافە، نـەختیٚ ئەڕوا ئەبێتە بەرد، بەردیٚ ڕوون وەك بلەور، أمّا مائل بە زەردیـە، لـە حقيقەتـدا ئەوە بەردە لە دەرونی أرض ئەبیٚ بە مايع لەگەلیٚ ئاو تێكەلاّو ئەبیٚ، وەكی ئـاو دێتەدەر جريان ئەكا، كە سارد بۆوە تجمّد ئـەكا. حاصـلّی عجايبـاتی صـنع لـە ئاوی معدنی وغيرە معدنی، (لا يعد)ە! نە خۆيان نە إلاهيان ناشكُری نەبیٚ چـی لیٚ نازانن! ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنْ الْمَاءِ بَشَرًا﴾ (تصوّر) كـە، كەسـیٚ زۆر (عاقـل)و دانا بیٚ (أمّا) ئاگای لە (قاعدە)ی (إلهی) بۆ (خلـق)ی (متطـوّرات) نـەبیٚ (خـالی الذهن)بیٚ، نـەختیٚ لـە (مـادە)يـی (مـاء)ی (بـشر)ی نيـشان دا، بلّـیٚ: "ئەمەيـە ئەبێتە (إنسان)، (إنسان)یٚ وەكی توو هەزار سوێندی بۆ بخۆی بڕوا ناكا".

ذرّەيیٚ حيوی لەناو ئەو ئاوە، ئەچێتە (موقع)یٚ (طـوراً بعـد طـور)ی بەسـەرا دیٚ، ئەبێتە (بشر)یٚ، (مـدرك)ی (خێـر)و (شـەڕ) (صـاحب)ی (عقـل)و (سمـع)و (بصر)، ئەبیٚ بـە (مخـترع)یٚ بـە (راديـۆ)" (نطـق)ی (طـە حـسين) لـە (مـصر) ئەباتە (لندن)، وە يا لە (لندن) ئەيهێنێتە (كۆيە)، باریٚ ئـەی كـەر پەرستينـە، (مـادام) (غـير)ی خـوا ئەپەرسـتن، بـۆ ئـەو (أعـاظم)ە (عبـاقر)ە (نوابـغ)آنـە ناپەرستن؟ باریٚ (هيچ نەبیٚ) بەو (إنسان)انە، (فخر) لەسـەر كـەرو گـاوو سـەگ بكەين، (رۆنتكين)و (كەهربا)يان بۆ (كشف) كردينـە، لەسـايەی وان، دەروونـی (إنسان)ی (أبينيـە)ی ڕەش وتـالیٚ بۆمـان بۆيتـە ڕۆژ! بـۆ وا (خُضْعَ الرِّقَـاب)، (نواقص الأبصار) لەبەر دەستی ئەو (حيوانات)ە، (هياكـل) ئـەو (حيوانـات)ە، ڕائەوەستن؟! هەی هـەر دووچـاوتان كـوێر بـیٚ، نەمـەك بـە حەرامينـە، (إنسان)

لەسەر (حیوان)ێ (هکذا)یی ئەکوژن! ﴿فَجَعَلَهُ نَسَبًا﴾ (ذکراً) ﴿وَصِهْرًا﴾ (أُنثى) (أسباب)ی (تذکیر)و (تأنیث) (بحّاث)آنی (فنون)ی (طبیعی) زۆری لێ ئەڵێن، (أمّا) هیچی بە (تحقیق) نیە، زۆریان لا (معتمد) بوو، ئەگەر (نرّە)ی (حیوی) بەلای ڕاستی (ڕەحم) علوق بکا ئەبێ بە نێر، بەلای چەپ (تعلّق) بکا، ئەبێتە مێ، (لکن) لەوچەندانە دیم، (بحّاث)ی بە (تجربە) (إثبات)ی کردبوو، وانیە. (مبیض)ەی لای ڕاستی مشکێکی (محو) کردبوو، باز لە زاووزێ، نێریش ئەبوو، مێشی ئەبوو.

(تعبیر) بە (نسبەت) و(صهر) لەبەر (زێد)ە (علاقە)یە ﴿وَكَانَ رَبُّكَ﴾ (ولا یزال) ﴿قَدِيرًا﴾ (مجبوراً) (إسناد)ی ئەو (إختلاف)ە بۆ (قدرەت)ی (إلە)ی ئەدەین، چارە نیە. ﴿وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا﴾ خوایە وا ﴿لاَ يَنفَعُهُمْ﴾ ئەگەر بی پەرستن ﴿وَلاَ يَضُرُّهُمْ﴾ ئەگەر نەیپەرستن. (ذاتاً) (أصنام) ئاگایان لە چ نیە، (مع هذا)، (لَهُن)ەکان ئەیان ترسێنن: (إنْ نقول إلاّ أعتراك بَعضُ آلهَتنا بسوء) وەکی شێخەکانی ئێمە ﴿وَكَانَ الْكَافِرُ﴾ (وهکذا یکون) ﴿عَلَى رَبِّهِ﴾ خوایە (حقیقی) (خالق البشر من ماء) ﴿ظَهِيرًا﴾ پشتیوانی (عدو)یتی، دوژمنایەتی خوای بە حەق ئەکا ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ مُبَشِّرًا﴾ بۆ (مؤمن)ی (صالح) ﴿وَنَذِيرًا﴾ بۆ (کافر). لێرە (بشارەت) هات، تۆ (وظیفە)ی خۆت، بەجێ ئێنی، (تأثیر) لەسەر تۆ نیە ﴿قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ﴾ لە (تبلیغ) ﴿مِنْ أَجْرٍ﴾ هیچ ﴿إِلاَّ مَنْ شَاءَ أَنْ يَتَّخِذَ إِلَى رَبِّهِ سَبِيلاً﴾ ئەوەندەم دەوێ، ڕووکەنە خوای، لە (کفر)و (سیّئات) دەست هەڵگرن، بەڕێی ڕاست دا بڕۆن (متوجّهین إلى الله) ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لاَ يَمُوتُ﴾ بۆ (نیل)ی (أجر)و (إستغنا) لەوان (واقعاً) ئەوی بمرێ، جێی (إعتماد) نیە ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِ﴾ (تنزیە)ی لەگەڵ ستایش ﴿وَكَفَى بِهِ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا﴾ چی لێ گوم نابێ، (جزا)یان ئەدات، (بێ) لەگەڵ (کفی)ی لە (موقع)ی (مهم)و (عظیم) (إستعمال) ئەکرێ خوا (کافی)یە، بۆ (خبر) داری بە (ذنوب)ی (عباد)ی، (مستغنی)یە لە (واسطە)ی (مخابر)ە (حاجەت) بە (شاهد)ێ دی نیە ﴿الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا

﴿بَيْنَهُمَا﴾ ئەو (خلق)ە، (عظیم)ە، (بدیع)ە، زۆرە –(لایُعَد ولا یُحْصی)یە– ﴿فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ لە شەش ڕۆژ، (أمّا) نابێ ئەو (أیّام)ە بە: یەك شەموو، دوو شەموو (تعبیر) بدرێتەوە، لە (بدأ)ی (إیجاد) ئەو جۆرە ڕۆژە، ئەو ناوانە، ئەو (ترتیب)ە، نەبووە.مەگەربڵێین: (بعده)بەگوێرەی ئەو (ئەطوارە)، ناویان بۆ داندرایە، (وهكذا) (دوام)ی (إستعمال)ی بوە (إلى اليوم)، وە (إلى ماشاء الله)" (مدّە)ی (بین) زۆر بێ، کەم بی، دیارە (خلق)ێ (تدریجی)یە. تەماشا (خلق)ی (إنسان)ەکی بە (٩) نۆ مانگ تەواو ئەبێ، لە (خلق) چ (شریك)ی نەبوە، خۆی بێ (معارض) کردی ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ بێ (إضطراب) بە (کمال)ی (إعتدال)و (إطمئنان)، چ کەس نەبوە (معارضە)ی بکا، (خلق)ی باوێتە (تدبیر)و (إدارە)یی (ملك)، ماندیش نەبوو بوو، لەسەر گازی پشتێ ڕاکشێ، (إستراحەت) بکا. وەئەبێ (ملك) ببێ ئەوجا (إستیلا)ی (عرش)ئەبێ –(ولو سابقاً) (عرش) بوو بێ ﴿الرَّحْمَنُ﴾ (قُلْ هوَ الرحمن آمنّا به) دیارە ئەو (خلق)ە لە (إیجاب) و (ضرورة)ەوە نیە، (منشأ)ی لە (ڕەحمەت)ە. لە (قرائەت)ی (مشهور) (معنی) لە (قرائەت)ی (جَرّ)ە: (لفظاً ومعناً) (متعلّق)ە بە (الحَيّ الذي لا يَموت) ﴿فَاسْأَلْ بِهِ﴾ (با)ی (تجریدی)یە: لام وایە ئەم (تجرید)ە، (نظر) بە (ذات)ی (مُجَرّد)ی (حقیقی) ئەگەر نەڵێین: "(فرض)ەکی (محال)ە" زۆر زۆر لە (أهل)ی (توحید) دوورە. با (ضمیر) بۆ (خلق)ی (مذکور) بێ وە ﴿خَبِيرًا﴾ با(عبارەت) بێ لە (جنابی حق)، (ذاتاً) (خبیر) بە (بدأ)ی (خلق)و (إیجاد)و (ترتیب)و (تفصیل)ی هەرئەوە، (لاشك) بە (فکر)و (خیال)و (وهم)و (مقایسە) نازاندرێ، دوایە بە (دقّەت) نۆڕیم، ئەوە (مختار)ی (سیّدی آلوسی)یە، (ڕەحمەتی لێ بێ)، وە چەند (وجوە)ی (ذکر) فەرمووە، کەمیان بە (وجە)ن ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اسْجُدُوا لِلرَّحْمَنِ﴾ دیارە (قوم)ێ زۆر (قاسی)ن، نازانن (رحمن) کێیە؟ چونکی نازانن(ڕەحمەت) چیە؟ (شخص)ی لە (سیاح)ان ئەڵێ: "چوومە ناو قومێ، ئەوەندە بێ (میل)و (محبّەت) بوون، لە (نعمەت) وزوبانی وان، (کلمە)کم نەدیت (دلالەت) لە (حب) بکا" (لاشك) (رحمن الیمامە)یان

پاش (تقرّر)ی (دين) وەرگرتيە، لە (إستعمال)ی (أصل)ی (عربی) نيە، ديارە (معاملە)ی (مرحمەت) كارانە، بۆ ئەوانە بێ (فائدە)يە (غضب شدە إينذار) ﴿أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا﴾ (حسب الأمر) ولو نەزانين چيە؟ لام وايە بتەكانی خۆيان نەدەزانی چيە؟ بۆيە (سجدە)يان بۆ ئەبردن ﴿وَزَادَهُمْ نُفُورًا﴾ (أمر)ەكە (نفرەت)يان (زياد) ئەكا، (أمّا) (رجوع)ی (ضمير) بۆ (سجدە)، (يعنی) (جنابی رسول)و (أصحاب)ی پاش (تلاوەت)ی ئەو (آية)ە، كەوتينە (سجدە)، ئەوان لێيان دوور كەوتينەوە، قەشمەريان پێ كردينە، (حقيقةً) لە (مقام) نافامرێتەوە، ئەوەی ئاگای لەو (ماجری)يە نەبێ، ئەوەی بە (خيال)دا نايە. حاصلّی من قبولّی ناكەم، ولو صاحبی (لُباب) فەرموويێتی ﴿تَبَارَكَ الَّذِي جَعَلَ فِي السَّمَاءِ بُرُوجًا﴾ هەرچەند (تفسير)ی (بروج) بە (بروج)ی (إثنا عشر)ەی (هيئەتی) (مختار)ی (محققين)آنە، وە(نسبەت)ی ئەدەن بۆ (إبن عباس)، لە (تفسير)ی (إبن جرير) ئەو (نقل)ە ئەو (تفسير)ە نيە، وەهەم لای من زۆر خۆش نيە، (أولاً): ئەو (تقسيمات)ە لە (أوّل)ەوە (تقسم)ی (منطقە)يە بە چوار (قسم)، (نظر) بە (تقاطع) و (تباعد)ی وی و(دائرە)ی (مُعدّل النهار)، (ثانياً) (تقيم)ی (كُلّ)ی (ربع) بە (٣) (قطعە) لە (توهّم)ی (دوائر)ی (عرضيە)و (منطقە)، لە (تخيلات)و (إعتبارات)ی (جعلی)يە، (فطری) (تعلّق)ی پێوە نەبەستووە، گەرچی (توهّمات)ێ (مضبوط)ە، وەكو (أنياب)ی (أغوال)و (رؤوس الشياطين) نيە. (ثانياً) ناويان بە (إعتبار)ی (أشكال) بە (حمل) و (ثور) (إلى) (جَدی) لە (وهم)ەوەيە، زێرا ئەو (كواكب)ە ئەوەندە لێك دوورن، نە (تشكيل)ی بەرخ ئەكا نەگيسك، بە دووربين بنۆرە (ثريا) (حس الحس) (كواكب)ی چەند لێك نێزيكن ئەبينی لێك دوورن. ئەگەر ئێمە بلّند تر باين، (توهّم)ی ئەو (أشكال)ە (مخصوص)ە لە (وضع)ی ئەو (نجومان)ە، نەدەهاتە (مخيّلە)مان (تفسير)ی بە (كواكب)ی (نيّر)ەی (ثوابتە)ی (سيّارە) لام جوانە، وەلەگەلّ ﴿وَجَعَلَ فِيهَا﴾ لە (سماء) ﴿سِرَاجًا﴾ (شمس)ی (نيّر)ی (أعظم)، (مناسب)ە، (سبحان الله) (أعمش) (سُرُج) بە (جمع) ئەخوێنێتەوە، (حقاً)

(قرائـەت)یّ بـێ (وجـە)ە، گەرچـی (صـاحب)ی (أنمـان)ی (نیّـرە)و (قـادە) (توجیە)یان بۆ کردیە. (ممکن)ە (سرج) بە (جمع) (مناسبە)ی لەگەڵ (بـروج) هەیە، (مراد) (کواکب)ی (عظیمـە)ی (بـروج)ان بـێ. (أمّـا) لـە (جهـەت) (قمـر) ئیش تێك ئەچێ ﴿وَقَمَرًا مُنِيرًا﴾ گەرچـی (حـساب)ی (سـنە) لەسـەر (سـێر)ی (قمر)ە (أمّا) (ترك)ی (شمس) خـۆی نیـە، خۆزیـا سـەد خـۆزی، ئـەو (جـۆر)ە (قرائەت)ە (نسیان) کرابان، وە ملایان خۆیان بە (توجیە)ی ماندی نەکردبایـە، با (أساساً) (منـوّر) نـەبێ، بـە (نـور)ی (مُفـاد) (مفیـد)ە. (خەبـەر)تـان هەیـە؟ (حکما)ی (غرب) خەریکن بفرِن، بۆ (قمر) بـچن، وە(بعـض)ی لـە (خیـاڵ) دان، نێزیکی بنەوە لە (أرض) ئەو (نوع)ە (تشبثات)ە، باشە، (فوائـد)ی تیـا ئـەبێ، (ولو) بە (مقصد) نەگەن ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ خِلْفَةً﴾ یـەك لـە جـێی یەك، یەك لە دوای یەك (مستمراً) (هكذا إلى ما شاء الله) (حقیقـة) ئـەو (جعـل)ە (دخل)ی کەسی پێوە نیە ﴿لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يَذَّكَّرَ﴾ (تأمّل)و (تفكّر) لە (قـدرەت)ی (إلهـی)و (عجایـب)ی (صـنع)ی بکـە ﴿أَوْ أَرَادَ شُكُورًا﴾ لەسـەر (نعمـەت)ی (کسابەت)و (إستراحەت). لام وایە خوا (لیل) و (نهار)ی نەکردیتە (خلـف)ە بـۆ (صاحب)ی (ذکر)و (ورد)و (أوراد)، ئەگـەر شـەو لـە یـادی چـوو، بـەڕۆژ بیکـا، بەشەو لە (فکر)ی نەبوو، بەڕۆژ بیکاتەوە. (آیة)ی (عامّە)، (أخـلاف)ی (لیـل) و (نهار) لە (أفق)ێ لە (آفاق)، یەك لە دوویـەکی، یـەك لـە جـێی یـەك، (آیـات)ی (لاتُعد)ە، وە زۆر بـە (نفـع)ە. بنـۆڕە (دنیـا)ی کـۆن و (دنیـا)ی نـوێ، (یعنـی) (أمریکا)، ئەبینی (أرض)ی (دائماً) لە (تجـدّد) و (حیـات) دایـە، خـاڵی نیـە لـە (خێر) و بەخشین، آخ ئەگەر (حیات)ی (بَشَری) کـەمێ (منـتظم) بایـە، لەگـەڵ یەك بەڕێکی (إمرار)ی (حیـات)یـان کردبـا، (إنـسانیەت)یـان وا پەسـت وڕەزیـل نەکردبا، (دنیا) زۆر خۆش ئەبوو، پڕ لە (آیات) پڕ لە (نعمەت)، مەردی (متفکّر) خەریکی (شکران)ەی (نعم)ی (إلهی) ئەبوو، وەکی (سعدی) ئەفەرموێ:

"هر نفسی کی فرۆ میرەوەد، ممدّی حیات أست،

پەس دەرهەق نفسێ دوو نعمەت موجود

وەبەر هر نعمەتێ شكرێ واجب.
أز دەست وزەبانی كێ بەر ئایەد؟
كەز عُهدەیی شكرەش بەدەر ئایەد"

ئەو گرۆهە ئەوا (متنفر)ن لە (عبادەت)ی (رحمن) جا بزانین ئەوەی (سجدە) بۆ خودا ئەبا، (رحمن)ی (عظیم الشأن) ئەپەرستێ كێن؟ ﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَانِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الأَرْضِ هَوْنًا﴾ بەسەر عەردی دا دەرۆن، بە نەرمی و (وقار)و (سكینە) (مزاحمە) ناكەن، خۆ بانادەن، بە (دەعیە) نارۆن، ئەوی لە رۆیشنی وابێ، لە هەموو شێ بە (رفق)ە، (لین الجانب)ە ﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ﴾ (سفها)ی نەزانی، قسە درشت ﴿قَالُوا سَلاَمًا﴾ ئەو (سلام)ە، (سلام)ی (إنقطاع)ە، وەك (سلام)ی (إبراهیم) لە باوكی بە قسەی ناشیرین (مقابلە)یان ناكەن، قسە لە (معاملە)ی (مسلّمان)و (كافر)ی نیە، حاجەت بە (نسخ) ناكا، (مكارم)ی (أخلاق)و (حسن)ی (آداب)و (معاشرە) (نسخ) (قبول)ێ ناكا. (الوسی) حكایەتێ (نقل) ئەكا، لە (إبراهیمی بنی مهدی) مامی (مأمونی الرشید)ی، هەرچەند (عباس)ی بوو، كردیشیان بە (خلیفە) (أمّا) (معنیً) لە رێزی (إبراهیمی بنی إسحاق)ی (موصلّی)و (أشباه)ی بوو، لە (مطربی) و (موسیقاری)، گوێ یا لە خەونا بە (خدمەت) (إمامی علی) ئەگا، ئەڵێ: "تۆ (دەعوای) (خلافەت) ئەكەی، بە (واسطە)ی ژنی – یعنی (حضرەتی زهراء)– ئێمە لە تۆ (لایەق) ترین، بە (خلافەت)" ئەو خەونە بۆ (مأمون)ی ئەگێرێتەوە، ئەڵێ: "نەم دیت، لە (علی) بلاغەت لە جوابدا" (مأمون) وتی: "بە چی جوابی دایەوە؟" وتی: "سلاما سلاما" (مأمون) وتی: (جواب)ێ بە (أبلغ)ی (جواب)ی دایەوە" (إشارە)ی بۆ ئەو (آیەت)ە كرد.

(إنسان) بڵێ: چی؟ كەدەریشەكی وا (مطرب)ی سازندە خۆی بە (خلافەت) لە (إمامی علی) (لایەق) تر ئەزانێ،

(جای آنست كی خوت موج زەنەد،دەر دلی لعل
زین تغاین كی خزف میشكەنەد بازارەش)

﴿وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَامًا﴾ (داخل)ى شەو ئەبن، شەويان بەسەردا دێ، راوەستاو لەسەر (قدم)ى (إخلاص)و (عبوديّەت)، گەردەن دادەيى (إطاعە) سەريان ئەهاوێتە سەر خاكى (مذلّەت)، بۆ خواى خۆيان، (سجود) گەرچى (عملاً) (مؤخّر)ە لە (قيام)، أمّا معنى مقدمە. (قيام) كەمێ بڵندى تيا هەيە، (سجود) لە هەموو (أنانيەت)ى دوورئەخاتەوە ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ﴾ پاش (قيام)و (سجود) يا (على الإطلاق) ﴿رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ﴾ لێمانى لادەى ﴿إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا﴾ (تفسير)ى بە (لازم) لام خۆش نيە، ئەگەر بڵێى: "(مقصد) (إستعاذە)يە، لە (عذاب)ى (أبد)ى كە بۆ (كافر)آنە، واى لێ دێ (أنّە) (إستعاذە) لە (كفر) ئەكەن"، لێرە خۆى نيە. (مراد) (صرف)ى (صرف)ە: هەر نەيبينن. (عباد الرحمن) وائەبن، تا (عبادەت) ئەكەن زێتر (خوف)ى خوايان لەدڵا پەيا ئەبێ. پێغەمبەر خۆى ئەفەرموێ: (أنا أعرفكم بالله وأخشاكم منه). ئەوانە وا ئەوانى ئێمە وەكى (پاپيان) بەهەشت ئەفرۆشن، (خوف) كووا؟! ﴿إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا﴾ (جهنّم) ناخۆشە، (مستقر) و (مقام) يەكن (يا غير)ن؟ (ألبتّە) (غير) بن باشە، (ولو) (بالاعتبار) وەفرقيشيان كرديە، لەبينى مقام و مقامن لەبەر إقامتە لە قيامە. أمّا إنسان نازانێ چى بكا؟ إفادە دانى، معانى تركيبيەى (عربى) بە كوردى زۆر (مشكل)ە، نە (مادّە)ش (واسع)ە نە (مفردات) و (مشتقّات)ى ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا﴾ ديارە (عباد الرحمن) لە (أريابى) (يسار)ن، (ذاتاً) (فقير) چى لە دەست نايە ﴿لَمْ يُسْرِفُوا﴾ لە حدّى (كرم)و (سخا) (تجاوز) ناكەن ﴿وَلَمْ يَقْتُرُوا﴾ بە خيلى ناكەن، لە مەيانە (صرف) ئەكەن، (حفظ)ى (مال) ئەكەن بۆ پێويستنى (ملك)و (ملّەت) ﴿وَكَانَ بَيْنَ ذَلِكَ قَوَامًا﴾: (وسط)، (عدل)، بەولاو بەولادا نەلەنگێ. رۆژێ لە خدمەت والى موصل (سليمان نظيف بگ) (رحمەت)ى خواى لێ بى، گفت وشنەومان بوو –(بالمناسبة) فەرمووى: "ملايان قصورەكيان هەيە، لە علمى إقتصاد نازانن" منيش (تبسّم)م كرد، فەرمووى: "بۆ؟ وتم: "(أولا): ئێستا (مەلا)يان، چاويان لە دەستى ئێوەيە، نا شكرى

نەبێ، دەستی ئێوەش صفرە، ملایان إقتصاد لەچی بکەن؟ (ثانیاً): ئەوی ئاگای لە (قرآن) بێ، علمی إقتصاد ئەزانی" وتی: "قورآن و(إقتصاد)؟" وتم: "بەڵێ" ئەو (آیة)ەم بۆ خوێندەوە، وەبە تورکی (إیضاح)م بۆ کرد" فەرمووی: "(عجایب) ئێمە وامان نەزانیبوو!" وەفەرمووی: (قرآن) (ملاحظە)ی (أهم القاعدتین)ی کردیە، (قاعدەی إستحصال)، (قاعدەی إستهلاك)، (قاعدەی إستهلاك) (أهمّ)ە، ئەوی ذکر کردیە". (واقعاً) وەکی ئەفەرمووی: قورآن تەماشای (إستحصال) ناکا، چونکی هەر خەریکە شتی پەیا کا، (داعی) هەیە، (داعی) (طبیعی) (مُغنی)یە لە (داعی) (شرعی)، (أمّا) (میل) بۆ (إسراف) و (تقتیر) ئەڕوا، ئەوەش (خراپ)ە، (قورآن) (تصریح)ی پێ ئەکا، (حتّی) (علی الأکثر) بۆ (سفاهەت) (بلا حساب) (صرف) ئەکەن، بۆ (خیر)ی بە ڕاستی (خێر) بێ، (بخیل)ن، بۆ (خێر)ی (مزخرف)یش خێران.

شەوی لە (أعظمیە) نووستم، (ملا نعمان)و (حاجی حمدی الأعظمی) وە (شێخ نوری) (مدیری کلیە) زۆر لطفیان نواند، سبەینەش خەریکی (أسبابی فطور) بوون، لەو وەقتە نازانم لەبەر چی؟ (قاموس)یان هینا لە (مادّە)ی (قتر)ە، تەماشایان کرد، ئەیان خویندەوە، (عرض)ی (ملا نعمان)یم کرد: (مولانا) ئێوە، ئەوەی مایەی جودو کرم و فضل بوو، بەجێتان هێنا، بۆ تەماشای (مادّە)ی (قتر)ە ئەکەن؟ فەرمووی: "(مقصد)مانە، (عرض)ی (جناب)ت بکەین کە (بخیل)ی نەفەرمووی، ئەمڕۆش لە (خدمەت) دابین" وتم: "(أستغفر الله) (ممنون)م، بە خدمەت ئێوە مشرّف بم، (أمّا) ئەوشەو ئەڕۆمەوە، (بعض)ی ئیش هەیە، ئەبێ دروست کرێ"، هەزار هەزار (رحمەتی لێ بی) (ضیاع)ی گەورە بوو، بۆ (إسلام)، تا (أبد تأسّف)ی (نعمان) و (سیّد رشید)م لە دڵ دەرناچێ. (مع الاسف) بێ جێ وبێ جێنشین ڕۆیشتن -(إنّا لله).

(سبحان الله) زێدە (إسراف)ی (مسڵمان)آن، پاش شکستی (حرب)ی (عمومی)و (قحط)و (غلا)ی (عام) بوو ﴿وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ﴾

(لازم)ە (عبـاد الـرحمن) زۆر (دقـەت) لـە (شـرك) بكـەن، (شـرك)ى (دينـى)و (إيمانى) لە (شرك)ى (كفر) (خراپ)تـرە، (قابـل)ى (إصـلاح) نيـە، بـە (عـين)ى (إيمان)ى (توحيدى) ئـەزانى، آنزيـادە ئاگايـان لـە (شـرك)ى (وراثـى) بـىٰ، كـە (أخفى من دَبيب النمل)ە، زۆر هەن حتّى لە ئێمە، (عبـادەت) ئەكەنـە (سُـلَّم)ى (معبودى)، ئەو (عبادالرحمن)آنە (إتخاذ) ئەكەن بە (إله)ێ (فـوق)ى (إلـه) ﴿وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّـهُ إِلاَّ بِـالْحَقِّ﴾ بـەو (طـران)ى كـە خـوا داينـاوە، كـێ (حق) وايە بكوژێ، بۆ (سياسەت) و (إستقامە)ى (أمور)ى خۆيان كەس ناكوژن چ جايە، بەبەهانەيە، ولأتێ كۆركەنەوە، بـەگوناە وبـێ گونـاە پيروجـوان، ژن و منداڵ بۆمبەردومان بكەن؟ وادەرئەكـەوێ (زمـرە)ى (سياسـيّون) ئـەمڕۆ (عبـاد الرحمن)يـان تيـا نيـە ﴿وَلاَ يَزْنُـونَ﴾ (عبـاد الـرحمن)، (عبـاد الله)، (أوليـاء الله) جێ‌ى (تأمينيّەت)ن، (حتّـى) (عـوام) (دائـر) بـە (نـاموس) و (أعـراض) لێ يـان (أمين)ن، ئەبێ ئەوانيش لە (حقيقەت)دا، (أمين) بن بە (صـداقەت)و (خلّـەت)ى (اوروپـى) يـى هەڵنەخەڵـەتێن، (فتـاة)ێ لـە بـاوش ئـەكا، بـە سـينگى خۆيـەوە ئەنووسێنى، گۆيا ئەمە (محبّەت)و (عطف) (حنان)ە، وەچەند ماچى باوكانە لە لێوو كوڵمى هەڵ ئەگرێ، خوا ئەزانێ درۆيـە! زۆر ناچـێ (فتـاة)ى قـوڕ بەسـەر زگى پڕ ئەبێ، ئەو باوكـە (رفيـق)ە، ئـەو (محـبّ)ە (صـادق)ە، (تـرك)ى ئـەكا، ئەوجا ئـەوى بەسـەرى دێ، دێ! (دخيـل)ەكـەم (أيّـها المؤمنـون) ئاگاتـان لـە (شرف)و (ناموس) بێ، بە (وسوسە)ى بێ (نـاموس)آن خۆتـان لـە (شـرف) لـە (دين) مەكەن ﴿وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ﴾ ئەوى (ذكر) كرا لە (شرك)و (بخل)، لـە (قتـل) وە لە (زنا) ﴿يَلْقَ أَثَامًا﴾ (عقاب)، (جزا)يە (سيّء)، (حاجـەت) نيـە، بـڕۆى بـۆ (جهنّم)و (جبل)و (بير)و (وادى) لام وايە (قرائـەت)ى (إبـن مـسعود) (أيّامـاً) بـۆ (إصلاح)ە، (ملاقات)ى (أشـهر) لا معنايـە خـۆش نـەبوە (آثـام) لـە (لغـەت) بـە (معنى) (عقوبەت)ە (والسّلام).

﴿يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ لە (عذاب)ى (دنيا)ش (نجاة)ى بێ لەئى (قيامەت) قورتار نابى، دووچەندانە ئەبى ﴿وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًـا﴾ (خاصـّةً) ئەگـەر

لەبەر (تکبّر) (جزا)ی (شرعی) نەدیبی ﴿إِلاَّ مَنْ تَابَ﴾ پەشیمان بێتەوە ﴿وَآمَنَ﴾ (إیمان)ێ (صحیح) بێ (غش) ﴿وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحًا﴾ (مقابل)ی (قتل)و (زنا) ﴿فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ﴾ (کأنّه) (علامەت)ی (قبول)و (صدق)ی (تۆبە)یە، (سعی) زۆر ئەکەن تا (بالمرّە) (أثر)ی گوناە لە (نفس)یاندا نەمێنێ. (أمّا) (أفندی)، مسڵمانی کوشتیە، (غزا)ی بۆ بنووسرێ؟ بڕوا مەکە ﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا﴾ لێ یان خۆش ئەبێ، (أمّا) ناگەنە (مقام)ی (عباد الرحمن). (ملا)یان لێرە (مضطرب)ن، (ظاهر) وایە ئەوانە بێ (تۆبە) (مخلّد) بن، ئەمەش (مذهب)ی (أصحاب العدل) (والتوحید)ە، وەهەم لە (سورە)یی (نساء) واتەگەیێ (قاتل) (عفو) ناکرێ، لێرە ئەگەیەنێ (عفو) ئەکرێ، (بعض)ێ ئەڵێن: "آیەتی ئێرە، بە آیەتی نساء منسوخە، نازانم ئەو نسخە چۆن ئەبێ؟ (أمّا) (جمهور) (توجیه) بۆ (آیة)ی (نساء) ئەکەن ﴿وَمَنْ تَابَ﴾ لە هەر گوناهێ بێ ﴿وَعَمِلَ صَالِحًا﴾ (حقّاً) بێ (عمل)ی (صالح) چ ناکرێ ﴿فَإِنَّهُ يَتُوبُ﴾ (یرجع) ﴿إِلَى اللَّهِ مَتَابًا﴾ (رجوع)ێ گەورە بۆ لای خوای (غفور)و (رحیم)، (أمّا) ناگەنە ئەوانەی بێ گوناە بووین. (ناکردە چو کەردە، کەردە چون ناکەردە) نابێ ﴿وَالَّذِينَ لاَ يَشْهَدُونَ الزُّورَ﴾ (حتّى) (لأحبّ أحبّائه وأقرب أقربائه). سوێند و(شاهد)ی بە درۆ ئێستا (تعمّم)ی کردیە، هەزار جار (أشهد بالله) ئەکێشێ، بە (قورآن) و(صفاتی کبریائی) سوێند ئەخوا بەدرۆ، (أمّا) بەسەری (شێخ)ی بەسەری (آغا)ی سوێند ناخوا ﴿وَإِذَا مَرُّوا﴾ على سبيل الصدقة باللغوی شتێ بێ خێر (من) وابێ فڕێ درێ وەك (حیکایەت)ی (ڕۆستەم) و (ئەسفەندیار) (مرّوا کراماً) تێ ئەپەڕێ ناچێتە ناویان (ولو) بزانێ ئیش و کاری پێیان ئەبێ. ئەمڕۆ (عُشْرەت) زۆر بووە، (خاصةً) لە (بین)ی (رجال)ی (أعاظم)ی (دەوڵەت). زۆر کەس لە (أهل)ی (عمامە) بوونە یاری مێزیان، (نائل)ی (مناصب)ی گەورە بوون.

ئەوی بە ملایەتی ماوە، خەریکی (تدریس) و(إرشاد) (وعظ) و (تفسیر) بوو ماوە، لە (کلیە)ی (أحزان): بێ یارو یاوەرو دۆست وبێ (حرمەت)و (معاش) —

إنّا لله- ﴿وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ﴾ ع قورانی ع (أکوانی) ﴿لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا﴾ بەسەریان ناکەون ﴿صُمًّا وَعُمْيَانًا﴾ بە کەڕی وکوێری، گوێ رائەگرن، تەماشا ئەکەن، (مُتّعظ) ئەبەن، (رؤسای دین) (خاصّةً) (أولیای طُرق) لەو (آية)ە بەر (حذر)بن. ئەگەر (آية)ی بەسەر (شێخ)اَ (قرائەت) کەی، هار ئەبێ، (مرید)ەکانی (إنسان)ی (کافر) ئەکەن، (دێن) بە (شێخ)ێ ئەڵێ ی؟ واو وا (آية) بەسەر (شێخ)ێدا ئەخوێنیتەوە؟

جارێ لە (وعظ)اَ ووتم: (ملا عبدالقادری گەیلانی) وای فەرموە، قادریەکان هار بوو بوون، کو ملا بە (حضرەتی غوث) ئەڵێ: ملا؟! (إنسان) لە (نصح)ی (ناصح)ان (مستغنی) نابێ. "ملایە"، بابم فەرمووی: "لە خدمەت کاك أحمد، بعضە رسائلی ویمان ئەخوێندەوە، أغلاطی کتابەتیم عرض ئەکرد، (تصحیح)ی ئەفەرموو. ڕۆژێ (نسخە)کی هێنا، فەرمووی: "ئەگەر ئازای (غلط) لەو (نسخە) بگرە" دەستم کرد بە خوێندنەوەی لە لاپەڕێ دووسێ (غلط)ی تیا بوو، فەرمووی: "حەل ناکەم، چاوت زۆر تیژە" ووتم: "قوربان، نا، إنسان عیبی خۆی نابینی" زۆر گریا، وتی: "بەخوای ڕاست ئەکەی".

چاك وایە (إنسان) (دائماً) لە (عیب)ی خۆی ورد بێتەوە ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ﴾ (مقصد)یان لە (معاشرە)ی (حلال)ی خۆیان (نتیجە)یە، (نتیجە)یە وا، دڵیان پێ‌ی (مسرور) بی، چاویان پڕکا، چاو لە دوای چیدی نەگێڕن، (أعیُنْ) (جَمع القِلّة)یە (مُتّقی)یان کەمن. (قرە العین) (یعقوب) لە (بین)ی دوازدان، یەك بوو، ئی (إبراهیم) (علیه السلام) لە (بین) (عدد)ێ زۆر، دوو بوون. گەلێ پیاوی گەورە، (أولاد)ی زۆر بوین، (لکن) بێ (قرة العین) مایە ﴿وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ (خصوص) (قُرَّةُ العَيْنِ)ی وا، دەها (نادر)ە، ببێتە (إمام الأتقیا)، پێرار لە شخصەکی سابلاغی أحوالی أولادی (میرزا فتاح)م پرسی، ووتی: "(أولاد)ی هەیە، بە أولاد حسیب نین، أمّا لە وجاغ کۆری چاترە".

خوايه (قُرَّةُ العين)ى بەندە، بكەيه (إمام الأئمة)، هەر دووكيان له (نوابـغ)ى (عبقر)يان (حساب) كرێن، بـه (عمـر)ى درێـژو (إقبـال)و (عافيـەت) زۆر بژيـەن ﴿أُوْلَئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا﴾ ئەو (عباد)ى (مذكور) (درجه)ى (عاليـه) لـه (منازل)ى (جنّة) ئەگرن، پاداشى (صبر)يـان لەسـەر (عمـل)ى چاكەو (تـرك)ى (خراپ)ە ﴿وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا﴾ له (غرفه) له (جنّەت) ﴿تَحِيَّةً وَسَلاَمًا﴾ (حرمـەت)ى خۆيان لەگەڵ (جاهل)آن (حفظ) كرد، (نائل)ى ئەو (إحترام) و (سـلام)ە بـوون، (إحترام)و (سلام) له طرف ملائكة، لـه (طـرف) (حـضرەتـى كبريائى)، ديـارە (جزا)يان (جزا)ى (حرمەت)و (تعظيم)و (تبجيل)ە ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ لـه (تَحيَّـة)، قەت بێ (حرمـەت) نـابن، (ابـد الأبـاد) (محـترم)و (مبجـل)ن ﴿حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا﴾ (مقابل)ى (مقابل)يان ﴿قُلْ مَا يَعْبَأُ بِكُمْ رَبِّي﴾ (أيّها السّادة القريـشية العربيّة) خـوا (مبـالات)تـان پـێ ناكـا، لاى بـه (حرمـەت) نـين ﴿لَوْلاَ دُعَاؤُكُمْ﴾ (عبادەت)ى (قلبى)و (قالبى) (إيمان)و (عمل)ى (صالح)، كەس به كـەس خـۆى لێ نەگۆڕێ، (نسبەت)ى (عمومى) بـۆ لاى خـوا يەكـە، (رَبُّ الكُـل)ە، (حرمـەت) لاى خوا به (إيمان)و (تقوى)يه ﴿فَقَدْ كَذَّبْتُمْ﴾ ئـى (رسـول)ى خـواى، چ نـەبێ ئەڵێن: "(شاعره)" بێ (إيمـان)و (عمـل)ى (صـالح) مانـەوە، لاى خـوا (حـق)ى (حرمەت)تان نەما ﴿فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا﴾ (جزا)يه (لازم)، (غير)ە (مفارق) چ له (دنيا) چ له (عقبى)، لـه (قـاموس) بـه (مـوت)و (حـساب)، (تعـبير) درايەتـەوە (نعوذ بالله من سوء الإنقلاب) (تَمَّ تفسير)ى سورەيى (فرقان) آخـر ڕۆژى مـانگى (قوربان) (منتهى)ى (سنه) (١٣٥٧)هـ (مقابل)ى (٧)ى (شباط)ى رومى.

## سورەتی (شعراء)

(مناسبة)ی (طباق)ی (تضادّ)ە، (شعر)و (قرآن)، (شاعر)و (رسول)، زۆر لێك دوورن، (مع أنّه) (تَفَوّه) ئەکەن، دەر (حق) (رسولی کبریاء) (صاحب)ی (فرقان)و (نور) ئەڵێن: "(شاعر)ە" وە (جنابی رسول) زۆر حەزی ئەکرد تکذیبی نەکەن، تووشی (عقاب)ی (إلهی) نەبن، ئیتر (ربط)ی دەها (قوەت)ی ساند. (عدد)ی (آيات)ی ئەو (سورەت)ە (٢٢٦) یا حەفتە، أکثری (مکیّ)یە، (بعض)ەکی (مدنی)یە. (زمخشری) ئەفەرموێ: "پاش سورەی واقعە نازل بوە".

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾

﴿طسم﴾ گوێ ڕاگرن، زەریف (إستماع)ی (آیات)ی (قورآن) بکەن (لا تَخرّوا علَيْها صُمّاً وعُمیانا) ﴿تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ﴾ ئەوانەی (إیمان)ی پێ نایەنن، بە (إقتراحات)ی هیچ وپووچ، لەو (آیات)ی (بیّنات)ە، (محروم) ئەبن ﴿لَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَفْسَكَ أَلاَّ يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾ (طبیعی) (جنابی رسولی اکرم) زۆر لای ناخۆش بوو، ئەوانە بە (کافر)ی برۆن، هەم لەبەر (قرائەت) هەم (إیمان)ی وان، ڕێی بەردەدا، بۆ (نشر) (دین)ی (مبین)، (عَقَبَە)یە گەورە بوون، ئەوەتە (ذات)ێ وەکی (محمدی مختار) (صبر)و (ثبات)ی کرد، خۆی ڕاگرت، وە(إلاّ) کێو لەبەر (صدمات)ی وانە، خۆی ڕانەدەگرت. (سوادی أعظم) لە (عرب) ئەیان نۆڕیە وان، (نفس)ی (خۆت) ئەکوژی؟ لەبەرە زێدە (وجد) و (تأثر) چونکی ئەوانە (إیمان) نایەنن. وادەرئەکەوێ، (جنابی رسالەت پەناه)، ئارەزووی بوو،

(بعض)ی (مقترحات)یان بێتەجێ ﴿إِنْ نَشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِمْ مِنَ السَّمَاءِ آيَةً﴾ (آیەت)ی (ملجیء) بێ (محیور)یان کا، (إیمان) بێنن ﴿فَظَلَّتْ أَعْنَاقُهُمْ﴾ ئەستوو کوردیان ﴿لَهَا﴾ بەو (آیة)ەکە ﴿خَاضِعِينَ﴾ کەچ وەل شۆڕیان بکات و (أکبر) وسەر ئەفرازیان نەیەڵێ. لە (حقەت)دا (مراد) (خضوع)ی خۆیانە، بۆیە (جمع) کرایە بە (جمع)ی (عقلاء)، (أمّا) لام وایە، ئەوەی لە (حقەت)دا، (مذکر) یا (مؤنث) نەبێ بە (لفظ) نابێتە (مؤنث) یا (مذکر). (عنق) هەر (عنق)ە — (خاضع) بێ، (خاضعه) بێ، (جمع)ی وەك (إبن عباس)و (مجاهد)و (إبن زید)و (أخفش)، (تفسیر)ی ئەکەن بە (جماعەت)، وە بە (کبرا)و (سادات)ی (جمعی) (تفسیر) کرایتەوە، وە(بعض)ە (توجیه)یان کردیە. زۆر سەیرن (مسئله)ی (تأنیث) و (تذکیر) ئەو تلاعبەی پێ ناوێ، خوا (قبول) ناکا، ئەو (آیة)ە جێی (دخل)و (مناسبه)ی لەگەڵ (بَني أميّة)و (بَني عبّاس) نیە. (روایەت)ی (هکذا)یی لە (إبن عباس) (نقل)ە، بڕوا مەکە (قول)ی وی بی، بێ (شك) درۆی زۆر، بەزاری کرایە، پیاوێ گەورەو (مقبول القول)ە. ئەو (آیة)ە چیە؟ بوە؟ ئەبێ؟ (مسئله) سەر ئەکێشیتە (زەمانی مهدی)؟ هەی هوو، دوورە!

(حقیقەت) (أقوال)ی هیچ، (حیف)ە (مُرکّب) وکاغەز لە نووسینەوەیان (صرف) کرێ. ئایا (آیاتی) (مقترەحە)یان بۆ بێ، (إیمان) ئێنن؟ دیسان لائەدەن، ئەڵێن: إنّما سُكِّرت أبصارنا" ﴿وَمَا يَأْتِيهِمْ مِنْ ذِكْرٍ مِنَ الرَّحْمَانِ﴾ کە ئەڵێن: "(وَما الرحمن؟)" نازان، چ (منافره)یەکیان لەگەڵ (رحمن) هەیە؟ ﴿مُحْدَثٍ﴾ ئەوان وەك (أشعری)، (معتزلی)یان شەڕ ناکەن، (کلامی) خوای (قدیم)ە؟ (حادث)ە؟ ئەو (دلالەت) ئەکا، (حادث)ە، بەڵێ (الفاظ)و (حروف) وایە، (أمّا) (کلام)ی (نفسی)یە، ئەو (قدیم)ە ئەدی ئەوانی ئەڵێن: "(لفظ)و (حروف) (قیدم)ە"، ئەڵێن: "چی؟" ئەی کەنە (حدوث)، بە (إعتبار)ی (ورود)و (ظهور). (أمّا) (کافر)ەکان گوێی نادەنێ، حاڵی وان نظر بە (ذکر)ی (محدث) نیە ﴿إِلاَّ كَانُوا عَنْهُ مُعْرِضِينَ﴾ پیشەی وان (إعراض)و ڕوو لێ وەرگێڕانە ﴿فَقَدْ كَذَّبُوا﴾ (تکذیب)ی (مستهزئان)ە ﴿فَسَيَأْتِيهِمْ أَنْبَاءُ مَا كَانُوا

بە ﴿يَسْتَهْزِئُون﴾ گەمەيان بە (آيات)ی (مُنْبِىءْ) بە (عذاب) ئەكرد، (آخر)ی پێيان ئەگا ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الأَرْضِ﴾ تەماشايان نەكرديە؟ كە (مهد)ی (معاش)يانە. ﴿كَمْ أَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ﴾ (آية) لەوەی گەورەتر هەيە؟ بۆ (أهل)ی (نظر). (أرباب)ی (عقل) (متحيّر)ن لە (قاعده)ی (زواج)، كە (جاری)يە لە (بين)ی (نباتات). (حقّا) ئێمە (ممنون)ی ئەو (بحّاث)آنەين كە (تعقيب)ی أحوالّی ئەو (كائنات)ە، ئەكەن (أسرار)مان بۆ بەدەرئەخەن. ئێمە لەبەر (تركيبات)ی (نحوی) ئاگامان لە (تركيبات)ی (كونی) نيە. پاش (كشف)ی (قاعده)ی (زواج)، خەريكن بۆ (إصلاح)ی (ثمار)و (منافع)ی. ئەگەر بۆی تەماشای (سرّ)ی (خواصّی) (طبيّة)ی (نباتات) (بمعناً شامل) بۆ (أشجار)، كەی، تۆماری ئەدەی، وە(تقدير)ی (سعی) (بشر) ئەكەی، چ (سعی)يە (بليغ)يان كرديە! ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً﴾ زۆر (لا يُعد ولا يُحصى). بنۆڕە (حيوان)ی گياو گوڵ ئەخوات، گيا ئەبێتە شيرو ماست و رون و پەنيرو كەشك و ژاژی، ئەبێ بە دونگ و گۆشت ودڵ وگورچيلەو، سيپەلك و دەمارو مێشك وچاوو (سائر)ی (آلات)ی (إدراك) ئەبێتە: موو، خوری، ئەبێتە ئاوريشم، ئەبێتە (بدأ)ی (إمرار)ی (وجودی إنسان). ئەو (آية) لە كوێ؟ (بيت من زخرف) لە كێ؟ (سبحان الصانع البديع!) ﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ ناشی تۆڕنێ، وەكی (حيوانات) دێن ودەچن، (أسرار)ی لە (كائنات) نازانن ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ (غالب)و (بالغ)ی (في الرحمة)ە، ئەو خۆيەتی، چەندە بە (قدرەت)و (قووەت)و (عظيم الشأن)ە، ئەوەندەش بە (لطف)و (كرم)و (رحمەت)ە! (وَرَحمَتَه وَسِعَت كلّ شيء) (وإلّا) لە مێژ بوو، ئەو (نوع)ەی (محو) كردبوون. ئەو (آية)ە (كريم)ە، لە چەند جێ (تكرار) ئەكرێ، وەكی (ترجيع) بەندی زۆر (لطيف)ە، زۆر بەجێيە ﴿وَإِذْ نَادَى رَبُّكَ مُوسَى﴾ بۆ (قوم)ت (ذكر) بكە، (أحوالات)، (آية)ی زۆر (ملائم)ە، وە(موجب)ی (تسليه)يە، بۆ (رسالەت) پەناه، وە (ماجری)ی (موسى)ی لە هەموان (مناسب) ترە. زێرا (موسى) خۆی زۆر (مشابه)ە، لەگەڵ (خاتم الرسل)، بۆيە

(جلال نوری) ئەیکاتە برای (معنوی) (خاتم الأنبیاء) ﴿أَنْ ائْتِ الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ (عظمة)ی (فرعون)و (سائر)ی (ملوك) ە (قوم)ە، (قوم)یان نەبیٚ، ئەوان چـن؟ (إستلا)ی (قومیە) کە (إزالە) بوو، (سقوط) ئەکەن ﴿قَوْمَ فِرْعَوْنَ﴾ (مشهور)ە ﴿أَلاَ يَتَّقُونَ﴾ وایان پیٚ بلـیٚ ﴿قَالَ﴾ (موسی) ﴿رَبِّ إِنِّي أَخَافُ أَنْ يُكَذِّبُونِ﴾ منیش (تحمّل) ناکەم، (غضب) ئەم گریٚ ﴿وَيَضِيقُ صَدْرِي﴾ سینگم، دڵم تەنگ ئەبیٚ (مشوّش) ئەبم ﴿وَلاَ يَنْطَلِقُ لِسَانِي﴾ قسان تێکەڵ وپێکەڵ ئەکەم، لە (وظیفە)ی (رسالەت) دەرئەچم. (إنسان) هەرچی بیٚ، کە (غضب) گرتی، قسەی باش و ڕەوانی بۆ نایە، دیارە (مقصد) لە گرفتی لە زبانی (حضرەتی کلیم) ئەمەیە، (سبحان الله) من زێد (إیمان)م بە (حضرەتی موسی) لەبەر ئەو فەرمایشتانەیەتی، دیارە زۆر توشنەلەبی (رسالەت) نەبوە، وەکی کۆنەکانی (خیالّیون) بڵیٚ: "بەسەر چاو (حاضر)م!" (جنابی رسالەت) لە چ (إضطراب) دابوو؟ تەمای بوو خۆی لە چیا هەڵدێری! ﴿فَأَرْسِلْ إِلَى هَارُونَ﴾ ئەو بە (حِلْم)ە، تووڕە نابیٚ، بە (فصیحی) (مرام) (أدا) ئەکات ﴿وَلَهُمْ عَلَيَّ ذَنْبٌ﴾ پیاوێکی لیٚ کوشتبوون ﴿فَأَخَافُ أَنْ يَقْتُلُونِ﴾ ناوێرم بچمە ناویان، لە پاداشی ئەو (شخص)ە ئەم کوژن، (ذاتاً) (خبر)ی درابوویە، (ملأ)ی (فرعون) (قرار)ی (قتل)یان دواە، بە هیچ وپووچ، بۆ بکوژرێم؟ (خوف)ی (موسی) لە (قتل) دوور نیە، (مع أنّە) وەکی (زمخشری) ئەفەرمویٚ، (مقصود)ی نەچوون، نەبووە، (مقصد)ی (تأمین)ە کە خوا (حفظ)ی کات، تا بە تەواوی (أدا)ی ئەو (خدمەت)ە (شاقّە) بکات (أهمّ)ی (حفظ)ە، بۆیە (أولاً)، ﴿قَالَ﴾ (جنابی حق) لە (جواب)اً ﴿كَلاَّ﴾ ئەو قسە مەکە، تۆ (محفوظ)ی وە(موفق)ی، (دووەم)، (رسالەت)ی برای ﴿فَاذْهَبَا بِآيَاتِنَا﴾ خۆت وبرات، ئەویشت بۆ (قبول) کرا. لەگەڵ برات بڕۆن، (تبلیغ)ی (رسالەت) بکەن ﴿إِنَّا مَعَكُمْ مُسْتَمِعُونَ﴾ ئاگادارتانم، خوا هەموو قسە لە هەموو کەس ئەبیێ. (خصوص)ی (معیّەت) دیارە (زێدە)یی یەکی تیایە، وەگویٚ ڕاگرتن بۆ خوا نابیٚ (ولو) (سمیع)ی بۆ بڵێین ﴿فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ﴾ (رأس)ی کارە، (ممکن)ە بڵێین: "(ظلم)ی (فرعون)،

لەمەڕ (قوم)ی بووە" بۆیە (براعەت)ی (عنوان) ناردنی، بۆ (قوم)ە ﴿فَقُولاَ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (ممکن)ە (إشارە) بیّ، بۆ (وحدەت)ی (رسالەت)، ناردراوین، (أمر)ی (إلە)یت (تبلیغ) کەین ﴿أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ (إرسال)ی (معنی)و (حسّی)، ئەوانیش عبادی (خوا)ن، وەك (قوم)ی تر مانیان لەو (ذلّة)و (أسارەت)، چ (وجە)ی نیە ﴿قَالَ﴾ (فرعون) ﴿أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا﴾ (بین العائلة الملوکیة) ﴿وَلِيدًا﴾ (قریب العهد) بە (ولادەت)، (یعنی) بە منداڵی بەخێومان نەکردی؟ نمەك بە (حرام) ئێستا (دعوا)ی (رسالەت) لەسەر من ئەکەی؟ ﴿وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ﴾ بە (کمال)ی (حریّەت)و (حرمەت) چەند ساڵ لە عمرت لەناو ئێمە مای، دوور لە (مذلّەت)ی (یهودی)، بە (عزّة)و (حرمەت)ی أولادی (فراعن)ە گەورە بووی ﴿وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ﴾ ئەوی کردت، (قتل)ی (قبطی)، (حق)ی نەبوو؟ (حضرەتی موسی) (عرضی کبریائی) بکا، (ولهم عليَّ ذنب...ألخ) (فرعون) چۆنی لیّ تۆڕیەوە؟ ﴿وَأَنْتَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾ چ (قەیدی)یە (فرعون) (حضرەتی موسی) بە (کافر) بزانیّ، (رهبان)ی (أوروپایی) (تشجیع)ی (قوم)یان ئەدەن، بۆ (حرب)و (عداوەت)ی مسڵمانان، (نسبەت)ی (أنواع)ی (کفر)و (ضلال)یان پیّ ئەدەن. لام وایە (توجیە)ی پیّ ناویّ، ئەگەر ئارەزووتە، بابە (معنی) (کفران)ی (نعمەت) بیّ ﴿قَالَ﴾ (موسی) ﴿فَعَلْتُهَا﴾ ئەو (فعلە)یەم کرد ﴿إِذًا﴾ ئەو (وەقت)ی ﴿وَأَنَا مِنَ الضَّالِّينَ﴾ ئەگەر (إحتیاج)ی بە (تأویل) بیّ، ئی (سابق) (إحتیاجی) نیە، (فعل)ی لە نەزانی (صدور) کرد، مردنی بە(وکز) لە (إتفاقیات)ە، لە (نظر)ی هیچ عاقڵیّ موجبی (قصاص) نیە ﴿فَفَرَرْتُ مِنْكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ﴾ کە (مؤامرە)ی (قتل)تان کردم ﴿فَوَهَبَ لِي رَبِّي حُكْمًا﴾ (علم)یّ شایانی (مقام)ی (رسالەت)، ﴿وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ (رسالەت)ی (أمر)ی (بدعەت) نیە ﴿وَتِلْكَ﴾ ئەو بەخێو کردنە ﴿نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ﴾ (أمّا) چ سوود، (ظاهراً) (نعمەت)، (حقیقە) (نقمەت)! ﴿أَنْ عَبَّدْتَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ خۆمت بە (عزّەت) بەخێو کرد، قوممت کردە عبدو أسیر و ژێردەست و ژێر چەپەلۆك ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ﴾ (سؤال) ئەکا لە (موسی) کە

فەرمووی: " ئەمن (رسول)م لە (طرف) (رب العالمین)" ﴿وَمَا رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ (حقیقەت)ی چیە؟ ئەزانی، ئەتوانی (بیانی) (ماهیّەت) بکەی؟ تابزانین (ممکن)ە (أمر)و (نهی)و گفت وگۆ، لەگەڵ تۆ بکا؟ بۆ (نجات)ی (قوم)یَ (إنسان)یَ بنێرێ؟ ﴿قَالَ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ (أجرام)ی (علوی)و (سفلی)، کێ ئەوانی (خلق) کردیە؟ (مدبّر) (شمس)و (قمر)و (سائری) (کواکب) کێیە؟ ﴿إِنْ كُنتُمْ مُوقِنِينَ﴾ ئەگەر (طلبی) (یقین) ئەکەن، دوای (ظنون)و (أوهام)و (میول)و ناکەون، تۆ چ (شأن)ەکت هەیە؟ لە (شؤون)ی (ربوبیّەت)، (وکذا) سائری (أجسام) ﴿قَالَ﴾ (فرعون) ﴿لِمَنْ حَوْلَهُ﴾ دیارە ئەو گفت وگۆیە، لە (مجلس) بوە ﴿أَلاَ تَسْتَمِعُونَ﴾ گوێ ڕاگرن، (یعنی) (مجرّد)ی (أستماع) (کافی)یە بۆ (ردّ)ی، من ئەڵێم: چی؟ ئەو ئەڵێ: چی؟! دیوتانە (جواب)ی (تفصیل)ێکە، بۆ (سؤال)یَ (إجمال)ی، من ئەتوانم بڵێم: "ما رَبّ السموات؟..الخ" ﴿قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ آبَائِكُمُ الأَوَّلِينَ﴾ ئەوەندەی بزانە، ئێوە (حق)ی (ربوبیّەت) و (إستعباد)ی کەستان نیە، ئێوە لە (أوّل)ینیش نین، (نتائج)و (فروع)ن ﴿قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ الَّذِي أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ﴾ شێتە، قسەی (متفرق) و (نا منتظم)ە ﴿قَالَ رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ ئەوانەی لەبەر دەستی توو نین، هەموو (حکومەت) و (حکم) ڕانن وەکی ئێوە، بەڵکوو زۆرجار (مغلوب)یان بووین ﴿إِنْ كُنتُمْ تَعْقِلُونَ﴾ ئەوا ئەتوو(إله) ئێمە بووی، (إلە)ی وان کێیە؟ بۆ (قبول) ئەکەی؟ (قوم)ی بەردەستەی خۆت، وا(رەزیل) ئەکەی، لەگەڵ (أقوام)ی (شرق) و (غرب) ناتوانی فزّە بکەی، (إله) وائەبێ؟ ﴿قَالَ لَئِنْ اتَّخَذْتَ إِلَهًا غَيْرِي﴾ هەرچی بێ ﴿لأَجْعَلَنَّكَ مِنَ الْمَسْجُونِينَ﴾ لە (محبوس)آن، وەکی شێت حەپست ئەکەم، یا لە(أمور)ی (سفیل)ە (إستخدام)ت ئەکەم. چۆن لەسەر حاڵی خۆت (تجبّر) بەسەر منا ئەکەی؟ لە(کلام)ی (ضمنی) (حضرەت)ی (کلیم) گەیشت، ناچار هاتە (صراحەت)و (جواب)ی (تهدیدی). ئایا (فرعون) (إعتقادی) دەر (حق) خوا، چۆنە؟ (ملا)یان قسەیان لێ کردیە، (امّا) (حقیقەت)ی (إعتقاد)ی (فرعون) و (مصری)یان لە (تأریخی) (عمومی)

کە لە (آثار)ی (عتیقە) وەگیرایە ئەزاندرێ ﴿قَالَ﴾ (موسی) ﴿أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَيْءٍ مُبِينٍ﴾ آیا ئەگەر (آیة)ی (ظاهر)ت بۆ بێنم، هەر (حەپس)م ئەکەی؟ نازانم ئەو (أو)ە لەگەڵ (لو)ی زۆر لەسەر (نوق) خۆشە، (نحوی)ش (مضطرب)ن ﴿قَالَ﴾ (فرعون): ﴿فَأْتِ بِهِ﴾ بی هێنە ﴿إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ لە (دعوی) لە (ما بِهِ صدْقُ الدَّعوی) ﴿فَأَلْقَى﴾ (موسی) ﴿عَصَاهُ﴾ (عصا)ی (معتاد)، (عصا)ی شوانی ﴿فَإِذَا هِيَ﴾ (عصا)یەکە ﴿ثُعْبَانٌ مُبِينٌ﴾ (إنقلاب)ی (عصا) بە مار، نابێ لەبەر (مجرّد)ی (صورەت) بێ، (ألْبَتّە) (حکمت)ێکی زیادی تیایە، وەکی (إبرا)ی (أكْمە)و (أبرص)ی (حضرەتی عیسی)، گەرچی نەمدیوە، کەس (تعرض)ی بۆ بکا، (أوّلاً): (مصری) (نوع)ە (علاقە)کی (إعتقاد)یان لەگەڵ مار هەیە، (أمّا) (ألآن) (تفصیل)ی لە دڵم دانیە، (دووەم): (مهارەت)ی (سحر)ە لەو (نوع)ە، (مُتَصَوَّر)ە ﴿وَنَزَعَ يَدَهُ﴾ هینایە دەر لە (جیب)ی ﴿فَإِذَا هِيَ بَيْضَاءُ لِلنَّاظِرِينَ﴾ (مقابل)ی (أیادی)، ئەگەر خۆت (مجروم) نەکەی، (یدی) (موسی) لەسەر تۆ گەلێ (فائق) ئەبێ. (سحر)ی (واهیمە) بەردار نیە. نەم دیوە (مقابل)ی (سحرە) (یدی) (بیضا)ی بۆ نواندبن، ئەوان بە (عصا) (إستفادە)یان کرد ﴿قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُ﴾ ئەوانی لە دەوری بوون ﴿إِنَّ هَذَا لَسَاحِرٌ عَلِيمٌ﴾ زانایە ﴿يُرِيدُ أَنْ يُخْرِجَكُمْ﴾ دەرتان بکا ﴿مِنْ أَرْضِكُمْ﴾ (مەفتەن)ی (عزیز) ﴿بِسِحْرِهِ﴾ (رسول) نیە، بە (سحر)ی خۆی (مقصد)ی وایە، لە (مملەکەت) و ولاتی خۆتان دەرکا ﴿فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ؟﴾ (رأی)تان چیە؟ (بیان)ی کەن، چیان لە (حق) بکەین؟ ﴿قَالُوا: أَرْجِهِ وَأَخَاهُ﴾ ئەوە (قرائەت)ی (عاصم)ە ئەوانی تر (أرْجِئْهُ) بە (إثبات)ی (همزە) ئەخوێننەوە، ئیشیان (تأخیر) کە ﴿وَابْعَثْ فِي الْمَدَائِنِ﴾ شارانی (مصر) ﴿حَاشِرِينَ﴾ پۆلیس، وادیارە پێ یان گوتینە: (حاشر)، (خەڵك)ی بۆ (سەرا)ی (مقام)ی (حکومەت) خڕ ئەکەنەوە. بیان نێرە، لە دووی (سحر)بازانی (مملکەت) ﴿يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ﴾ لە (حق) (کلیم) گوتی، "(ساحرٌ ملیمٌ)". ئەبی لێرە، شتێ (زیاد) بێ، بۆیە ئەڵێ: "(سحّار)" (یعنی) سەرامەدانی (سحرە)، (طبیعی) ئەوانە (مشهور) و

(معروف) بووین، (إمتیان)یان (مهلوم) بوە ﴿فَجُمِعَ السَّحَرَةُ﴾ (مَهَرە) ﴿لِمِيقَاتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ﴾ بیّ (تـأخیر) ﴿وَقِيلَ لِلنَّاسِ﴾ بە یەکتریان ئەووت ﴿هَلْ أَنتُمْ مُّجْتَمِعُونَ ؟﴾ گرد ئەبنەوە، لە جیّ ی (مناظرە)؟ ﴿لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ السَّحَرَةَ﴾ چیتر دوای (کهنە) ناکەوین، خۆیان کردیتە (واسطە) لە (بین)ی ئیّمەو (إلە)ە، (عزّة)یان بۆ (سحرە) نەهیّشتیە ﴿إِن كَانُوا هُمُ الْغَالِبِينَ﴾ دیارە ئەوانە لە (مسلّمان)ان بە (إنصاف)ترن، (مناظرە)ی (أجانب) بۆ علمایانە، (مَعَ أنّهُ لله الحمد) (غالب) ئەبن، وە (أمەت) (إتباع)یان ناکەن، واز لە شیّخانی گومڕاە ناهیّنن ﴿فَلَمَّا جَاءَ السَّحَرَةُ﴾ بۆ (حضور) ﴿قَالُوا لِفِرْعَوْنَ﴾ (ذات)ی (ملکی) ﴿أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا ؟﴾ (أجر) و پاداشتیّ شایان ﴿إِن كُنَّا نَحْنُ الْغَالِبِينَ﴾ بەسەر (موسی) ﴿قَالَ: نَعَمْ﴾ بەڵیّ (أجر)یّ شاهانە ﴿وَإِنَّكُمْ﴾ (مَعَ ذلك) ﴿إِذًا﴾ لە (إعتبار)ی (وقت)ی (غَلَبە) ﴿لَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ﴾ وەك: (أشراف)و (مُتحیّن)ان، بارەگاه هیچ نەبیّ، بیّنە ریّزەی (کهنە) ﴿قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ: أَلْقُوا مَا أَنتُم مُّلْقُونَ﴾ ئیّوە (اولا) باویّن ئەوی ئەیهاویّنە ساحەی (مُناظرە)، نازانم أمری بە (سحر)کردن، کردیە؟ یا(رعایەت)ی أمری، (عنوان)دن بوە؟ (میدان)ی (مقابلە)و (محاربە)یە، (أول)ی (دعوەت)و، چ (دین) لە گۆڕیّ دا نیە بزانین، (سحر) (حلال)ە (حرام)ە؟ (معصوم) (أمر)ی پیّ ئەکا، پیّ ناکا؟ ﴿فَأَلْقَوْا حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ﴾ گوریس و (عصا)یان، ﴿وَقَالُوا بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ﴾ قسم (بە جاهو جلال و قوەت و غلبەی ذاتی خوداوەندی) ﴿إِنَّا لَنَحْنُ الْغَالِبُونَ﴾ (أجر)ەکەی (حاضر) کە ﴿فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ﴾ (إنقلاب)تی بوو بە (ثعبان) ئەژدیهایە (عظیم) ﴿فَإِذَا هِيَ﴾ (عصا) (حقیقة) هەر (عصا)بوو ﴿تَلْقَفُ﴾ هەڵی ئەلووشی ﴿مَا يَأْفِكُونَ﴾ ئەوەی (إفك)یان پیّ ئەکرد، بە چەشم بەندی، ئەیان نواند، مارە (حرکە) ئەکا ﴿فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ﴾ (كأنّهُ بلا إختیار) کەوتنە (سجدە) ﴿قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ کەسی تر (حق)ی (ربوبیەت)ی نیە ﴿رَبِّ مُوسَىٰ وَهَارُونَ﴾ کە ئەیان فەرموو: "(رب العالمین) ئیّمەی ناردوە." ﴿قَالَ﴾ (فرعون) ﴿آمَنتُمْ لَهُ قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ﴾ بیّ (إذن)ی من ئەمە چۆن ئەبیّ؟ دیارە

(إذن) نادا ﴿إِنَّهُ لَكَبِيرُكُمْ الَّذِي عَلَّمَكُمْ السِّحْرَ﴾ (حقيقةً) قولی نابەجا، (لاشك) (ذُهول)ی بەسەردا هاتیە. (موسی) لە (أول)ی (نشأت)ی (حالّ)ی لای (فرعون) (معلوم) بوو، دوایە کەهاتەوە (ولو) (فرض)کەین (تعلم)ی (سحر)ی کردبوو، (رأسا) هاتە سەر (فرعون)، (بَعْدَهُ) (فرعون) ناردی، ئەو (ساحر)انەی خر کردەوە. کێ دیتی؟ کەی (تعلیم)ی کردن؟ کۆیی (سحره) بە چ (شوق)ێ هاتنە مەیدان، بە (تعظیم)ی، سوێندیان بە (عزت)ی (فرعون)ی خوارد ﴿فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ ئەزانن چتان پێ ئەکەم ﴿لأَقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ مِنْ خِلاَفٍ﴾ راست و چەپ ﴿وَلأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ هەمووتان ﴿قَالُوا لاَ ضَيْرَ﴾ زەرەری نیە ﴿إِنَّا إِلَى رَبِّنَا﴾ (رب العالمین)، ربی (موسی) وە (هارون) ﴿مُنْقَلِبُونَ﴾ (إنقلاب)مان بۆ لای خوای خۆمانە خوای (حقيقی) ﴿إِنَّا نَطْمَعُ أَنْ يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَايَانَا﴾ ئی (سابق) ﴿أَنْ كُنَّا أَوَّلَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ لە (قوم)ی تۆو. (أما) (قرائەت)ی (إنْ) (إن)ی (شرطية) (حقيقةً) (معنا)یە (لایەق)نیە، جا گوێ لە (توجيه)ی (نحوی)یان کە، ئەوانە لە (أهل)ی (علم) بوون، (إيمان)یان هێنا، بەو (إيمان)ە، چ جایە پاداشت و (تَقَرّب)ی لای (فرعون) نەما لە ئۆغری ئەو (إيمان)ە، (إستحقاق)ی (حيات)یان کرد، ئەبێ وابێ. لام وایە (إيمان) وانەبێ، کەڵك ناگرێ. ئەوەش بە (إنْ كانَ كذا، كان كذا) پەیا نابێ. (فرعون) لەسەر (عناد)ی خۆی ما، (بنی إسرائیلی) (إیذن) نەدان ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي﴾ شەوڕۆیان پێ بکە، بەشەو برۆن ﴿إِنَّكُمْ مُتَّبَعُونَ﴾ بە دواتان ئەکەون —(حسب الأمر) ڕۆیشتن، سبەینە (فرعون) خبری زانی ﴿فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِي الْمَدَائِنِ﴾ ئی (مصر) ﴿حَاشِرِينَ﴾ (شرطه) گریان کاتەوە، بە دوای (بنی إسرائیل) کەون ﴿إِنَّ هَؤُلاَءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ﴾ (طائفە)یە سفلە و کەمن، ئەبێ کەم بوو بن، (إستخدام)یان بەو (نوع)ە (ذلّەت)ە (مانع) لە (كثرەت)ی (توالد)، و(قتل)ی (ذكور)یش (علاوە) وە (قوم)ی زۆر ماندی بن، (قووەت) (صرف) کەن (خاصە). لەگەڵ (ذلّەت) و (عذاب)، (عمر)یان کورت ئەبێ. (ومع هذا) دیارە ئەوەندە عسکرەی لە عاصمە نەبوە تَعَقّبی بَنی إسرائیلی پێ بکات

(إحتياج)ی بووە بە (عسكر)ە شارەكانی دی. ديارە لە (مشرب)ی (بريتانيا) دابوە، بە لەشكری زۆر ئەچنە سەر (شرذمە)یە كەم. وەهەرچەندێ بووبن، ديارە لەشكری (فرعون) گەلێ لە (بنی إسرائيلی) زۆرتر بووين (لكن) (مبالغ)ەش زۆر بەجێ نيە، لەشكری (مقدمە)ی حەفت سەد هەزار سوار بووبێ، دەبێ ئەوی دی چەند بووبێ؟! ئەو لەشكرەی كوو بەخێو ئەكەن؟ لە كوێ جێيان ئەبێتەوە؟ لە چ (جبهە)یە دادەمەزرێن؟ بۆ (حرب) لە حربی (عمومی) (حكومەتی عثمانی) كە (مصر) ويلايەتی بوو لە (ولايات)ی، بە هەموو (سعی) و كۆشيش، دوو (مليون) (عسكری) پێ هاتە (تحتی سلاح)! (وداثراً ما دار)ی مملكەتی جبهەی حرب بوو.

(لكن) (نقّال)ان بێ (محاكمە)ن ﴿وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَائِظُونَ﴾ ئەوەی رقی مەی پێ ببێتەوە، ئەی كەن ﴿وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَاذِرُونَ﴾ (عاقبەت) ئەنديشين، نابێ (إمهال)يان بكەين، بەبێ (مبالاتی) لێ يان گەڕێين. (حذر) لە (مستقبل) لەگەڵ (تدارك)و خۆ (حاضر) كردن زۆر باشە، يەكێكە لە (مزايا)ی دەوڵەتی (بريتانيا)و (سائر)ی (دول)يش. تەماشای ئەكەن، ئەمڕۆ غەمی هەزار ساڵ دوايی ئەخۆن، (إخطارات)ی بۆ ئەكەن، ئيشيان لا بە (أهميەت)ە. بۆ دەركردنی (اوزدمير) لە (رواندز – با وجودی (شرذمە)یە بێ أسبابی لەگەڵ بوە– بە لەشكری (متجاوز) لە چوار هەزار (نفر) (مع معدات)ی حربی، طرازی جديد، قائدی ناردنە سەر، دەری كردن ﴿فَأَخْرَجْنَاهُمْ﴾ (فرعون)و (جنود)ی ﴿مِنْ جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ لە (أطراف)ی (نيل) ﴿وَكُنُوزٍ﴾ (خزينە)و (دفين)ە ﴿وَمَقَامٍ كَرِيمٍ﴾ (قصر)و (قصور)ی (مجالس)ی (أشراف)و (أمراء)، (منابر)ی (عظماء)، قشڵەيی (عسكری) ﴿كَذَلِكَ﴾ بەو (نوع)ەمان دەركردن، لای خۆيان بۆ (تعقيب)ی (خصم) چوون، خۆيان گرفتار بوون ﴿وَأَوْرَثْنَاهَا بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ ماڵيان بوە ميراتێ دوژمنيان، (لكن) (مع الاسف) (محافظە)يان پێ نەكرا، ئەوجا هەڵاتن بە (طريق)ی (بَرّ) بۆ لای (سوريە). (ذاتاً) ئەو (وەقت)ە (قتال)ی (سوێش) نەبوو، (أنّە) لەو (آن)ە كە (فرعون) لە (مصر) بە

دەرکەوت، ماڵیان بوە میراتی (بنی إسرائیلی) وە(إلاّ) هێشتا (خلاص) نەبووبین، بۆیە ئەفەرموێ، ﴿ فَأَتْبَعُوهُمْ﴾ (فرعون)و (جنود)ی. (ذاتاً) ئەوان بۆ (تعقیب) چوون، (عاقبەت)یان خوا ئەیزانی، ﴿ مُشْرِقِينَ﴾ (وقت)ی (شروق)ی (شمس). (ظاهر) وایە تا لەشکری (مدائن) (جمع) نەبووبین، دوایان نەکەوتبن، (تأمّل). (أبو عبیدە) ئەڵێ: "(مُتَوَجهِين نحو الشرق)" تا نەنۆڕمە (خریطە) ی (مصر)و (وضع)ی (بحر)، نازانم بڵێم: چی؟ (معلوم)ە (مصر) لە (غرب)ی سوریەیە ﴿ فَلَمَّا تَرَاءَ الْجمْعَانِ﴾ لێك نێزیك بوون، لێك بەدەر کەوتن، کە یەك ببینن ﴿ قَالَ أَصْحَابُ مُوسَى﴾ (تدبیر) چیە؟ ﴿ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ﴾ پێمان ئەگەن، وە(معلوم)ە دەرەقەتیان نایەین ﴿ قَالَ﴾ (موسی) ﴿ كَلَّا﴾ پێتان ناگەن ﴿ إِنَّ مَعِي رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾ ڕێی (نجات)م نیشان ئەدا ﴿ فَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْبَحْرَ﴾ لێ یدە، لێ یدا ﴿ فَانفَلَقَ﴾ لێك بۆوە ﴿ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ﴾ (قطعە)ی ئاو ﴿ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ﴾ وەکی چیای گەورە، (مقوّسی) بە (جهەتی) (مصر). بە ناو ئاویدا چوون ئەوان هاتنەدەر، (فرعون)و (قوم)ی دوایان کەوتن، (جبال)ی ئاو یەکتری گرتەوەو خنکان". (أما) پەڕینەوە لە (بحر)ی (قُلزم) بۆ لای (شام)، (غیر)ە (قابل)ە، بە (مدّ)ی (نظر)یانە، ڕۆژی لێ ئاوا ئەبێ، لێ ی هەڵدێ ساحلی دیار نیە (واحدی) ڕەحمەتی لێ بێ وائەفەرموێ، ئەو قسە (قول)ێ بزرە، (صاحب)ی (نظر)ە.

لە (تأریخ)ی کۆن وەرئەگیرێ، (موسی) لەگەڵ (قوم)ی پاش (غرق)ی (فرعون) و چەندێ، گەڕاوە (مصر)، (نمام)ی (إدارە)یان هاتە دەست تا (١٣)ە ساڵ مان، بەڕوایەت لە (واحدی)، دە ساڵ. دوایە لە (عائلە) (حُکم) داری، یەکی چوو بوە (حبشە)، (إلتجا)ی بەوی کردبوو، لەشکرێی هێنا بۆ سەر (بنی إسرائیلی) لە (مصر)، ئەوانیش زوو (فرار)یان کرد، بۆلای (فلسطین) ڕۆیشتن. ﴿ وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ﴾ لەوێ ﴿ الآخَرِينَ﴾ (قوم)ی (فرعون)ی لە (قوم)ی (موسی) نیزیك کردنەوە ﴿ وَأَنْجَيْنَا مُوسَى وَمَنْ مَعَهُ أَجْمَعِينَ﴾ کەسیان لێ نەخنکان ﴿ ثُمَّ أَغْرَقْنَا الآخَرِينَ﴾ با (وجود)ی لەناو ئاوی لێك نێزیك بوون،

نەدەهاتە (خیال)، ئەوان (نجات)یان بێ، وەئەمان قورتـار نـەبن ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً﴾ تابڵێ، (عظیم)ە ﴿ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ (بقیّە)ی (قوم)ی (فرعـون)، أهلی (مصر) یا (بنی إسرائیلی). باوەڕیان نەبوو، کە (نجات)یان ئەبێ، (وثوق) و (إعتمـاد)ی (علـی الـنفس) وە(قـوەت)ی (إیمـان) (دخـل)ی نـەبوە، لـە (نجات)یـان، بـەس (قـدرەت)ی (إلهـی). (أمّـا) (رجـوع)ی (ضـمیر)ی (هُمْ) بـۆ (قوم)ی (خاتم الرسل) (حقیقةً) بە دڵدا نایـە (ولَـوْ) (سـیّدی الوسـی) وە (شـیخ الآسـلام) إختیاریـان کردبـێ بـەڵێ (ممکـن)ە بڵـێین: "(تعـریض)ی تیایـە، بـۆ ئەوانەی (إقتراح)ی (آیات)یـان ئـەکرد، وەکـی (آیـاتی رسـل)ی رابـوردوان. ئـەو (قوم)ە ئەو (آیة)ە (باهرە)یان دیت، (إیمانیان نەیەنا، (عداوت)یان (زیاد) کـرد، دووبارە لەشکریان هێنایە سـەر (موسـی)، لـە (مـصر)یـان دەرکـردن، ئێـوەش (قــوم)ێ (عنــود)ن، نایەنــە ڕای" ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ﴾ دیــارە (خطــاب)ە لەگــەڵ (پێغەمبــەر) (ﷺ) ﴿ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ (غالــب)ە لەســەر (عــصات) و (جبابرە)ی (أشدّا)ی (أقویاء)، (رحیم)ە بە (ضعفا)و بێ دەسەڵاتان.

(إنفـلاق)ی (بحـر)و (نجـات)ی (موسـی)و (هـلاك)ی (فرعـون) بـەو (نـوع)ە، (مَلاحِـدە)ی (أوروپـایی) خۆیـان، (تـابع)ی (کتـاب)ی (مقـدّس)ن، لێمـان ناسەلمێنن. (أمّا) شتێ هەیە، (مجبوری)و (ضرورەت) (إنسان) (مجبـور) ئـەکا (قول) بە شتێ بکا، (ولو) زۆر (خلاف)ی (معتـاد)و (خـلاف)ی (طبیعـەت) بـێ، (ولـو) نـەتوانێ (تـصوین)ی بکـەی زێـڕا (عاقـڵ) (مقابـل)ی (واقـع) چـی پـێ ناگوترێ. (عزّەت)و (فرعون)و (جندی)، (نجات)ی (موسی)و (قوم)ی، (ثابت)ە بـێ (شـبهە)یـە، دەبـزانم ئـەوان کـوو (غـرق) ئەکـەی؟ ئـەمان کـوو (نجـات) ئەدەی؟ئەگەر (ضرورة) نەبێ، ئێمەش هەندە (بسیط) نین، بێ (محاکمە) شت قبوڵ کەین. بەڵێ (ملّیون) (بُسطا)مان زۆرن، (أمّا) (نوی الأحلام)یشمان هـەن، کەم نـین ﴿ وَاتْلُ﴾ (یـا محمـد) (ﷺ) ﴿ عَلَيْهِمْ﴾ لەسـەر (قـوم)ی خـۆت ﴿ نَبَأَ إِبْرَاهِيمَ﴾ بابە گەورە ﴿ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ﴾ (ذاتاً) (نبأ)ی (رسل) ئـەو (نـوع)ە (مقصود)ە، (إبراهیم) کوڕی فلان کەسی بوو، لە فڵان جـێ بـە ولـد بـوو، ئەمـە

(تأریخ)ە، (وظیفە)ی (مؤرخ)آنە، (فائدە)ی هەیە، گەرچی (مع الأسف) لە کەمی بە (حقیقةً) ئەگەین ﴿مَا تَعْبُدُونَ﴾ چی ئەپەرستن؟ ﴿قَالُوا نَعْبُدُ أَصْنَامًا﴾ بە (صراحەت) بێ (إنفعال)، ﴿فَنَظَلُّ لَهَا عَاكِفِينَ﴾ بە ڕۆژ بە ئاشکرا بێ خوف وهەراس، بە (حُرِّیەت) بە (علنی) عبادەتیان ئەکەین (ملازم)ی (خدمەت)یانین ﴿قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ﴾ گوێیان لێتانە، کە هاواریان ئەکەنێ؟ ﴿أَوْ يَنْفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ﴾ چیان لە دەست دێ لە (نفع)و (ضرر)؟ ﴿قَالُوا بَلْ﴾ ئەزانین بێ گوێن، بێ (قدرەت)ن، ئەوەندە هەیە ﴿وَجَدْنَا آبَاءَنَا كَذَلِكَ يَفْعَلُونَ﴾ ئێمەش بە دوای وان کەوتینە، چیان پەرستیە، ئەوەی ئەپەرستین ﴿قَالَ أَفَرَأَيْتُمْ مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ، أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمُ الأَقْدَمُونَ﴾ دیتیتانن؟ ئەیان ناسن چن؟ ﴿فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِي﴾ دوشمنی منن، (حقیقةً) من دوژمنیانم ئەو (أجرام)ە (خسیس)ە بۆ پەرستن نین، گەر لە دارین، بۆ سووتاندنن وەك بەردن، بۆ بنای بەرن، باز (أشباه)ی، ئەگەر (معادن)ن بۆ قاپ و قاچاغ، ئەگەر زێرو زیون، بۆ (نقد)و پارە، سەد هەزار هەندەش باشترە بەبێ هوودە ئەو ماڵە بۆ (خسار) بێ؟ ﴿إِلاَّ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ (داخل)ی ئەو (معبود)انە نیە، (إله)ێ (حقیقی) یە، ئێمە (عبد)ی وین ﴿الَّذِي خَلَقَنِي﴾ (إیجاد)ی کردیمە ﴿فَهُوَ يَهْدِينِ﴾ بە (وهبی)و (کسبی) ﴿وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي﴾ (وَلا يُطعَمْ) ﴿وَيَسْقِينِ﴾ خواردن و خواردنەوەم لەسەر وی یە، (أصول)ی (أرزاق) بە (خلق)ی ئەوە ئاو لە ئاسمان ئەو ئەینێری، لە عەردا ئەو (إدّخار)ی ئەکا، ئەی کا بە چەشمە (ممکن)ە، (دەوڵەت)ی بێ (تکلّف) بە دەست کەوتبن، کەسێ خۆشی بۆ بێ، (کورد) ئەڵێ: "خوا بە سەری دادەبارێنێ!" ﴿وَإِذَا مَرِضْتُ﴾ ئەگەر بی فەرموویا: (أمرَضَنی)" بە جاری (ابراهیمیّون) لە دەست ئەچوون وای فەرمووە، (أکثر) ئەڵێن: "نەخۆشی خەلاّتی خوایە، کێ بێ بە خەلاّتی خوا (راضی) نەبێ؟" وە بۆیە (بلاء) ئەوەندە زۆر بوو، ئەوەندە (رسوخ)ی ساند ﴿فَهُوَ يَشْفِينِ﴾ ئەو قسەیە (غایەت) (حکیمان)ەیە ئەمڕۆ (حُذّاقی) (أطباء)

ئەڵێن: "طبیعەت خۆی تداوی ئەکات، دەرمان و علاج نوعە معاونەتێکە، باری گرانتر نەبێ. خۆی وردە وردە، (قوّەت) ئەستێنی، عوراضی دفع ئەکات؟"

(شێخ)ی (رئیس) لە نەخۆشی مردنی فەرموی: " ئەوەی (تدبیر)ی (بدن)ی ئەکردم، نەماوە، (علاج) (تأثیر)ی نیە." ﴿وَالَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ﴾ (موت) وەك (جبات) (آیـة)ە، گەر (نفس)ی خۆی (نعمەت) نەبی، بۆ (أهل الله) (مفتاح)ی (نِعَم)ە، لە (أكدار)ی داری (دنیا) (نجات) بوونە، (حیات)ی دوایە، (مُوَسّعاً) (حیات)ی (حقیقی)یە ﴿وَالَّذِي أَطْمَعُ﴾ با بە (معنی) (أمل) بێ ﴿أَنْ يَغْفِرَ لِي خَطِيئَتِي﴾ ئەگەر ببی ﴿يَوْمَ الدِّينِ﴾ (عفو)ی (بكا) لێ ی خۆش بێ، (حاقە) نیە ئێمە گوناهی بۆ بدۆزینەوە، وەلێ ی خۆش ببین، وە(نزاع) بکەین: رسول معصومە یاخود گوناحی لێ صادر ئەبێ. ئەبێ بنۆرینە. (خلیل الرحمن) وخۆمان، کە ئەو وابپاڕێتەوە، ئەبێ ئێمە چی بکەین؟! کەسێ لەسەر (ملّەت)ی (خلیل) بێ، (لازم)ە زۆر بە (إحتراس) بێ، لە خوای بترسێ، بەهیچ (وجە) (مغرور) نەبێ ﴿رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا﴾ بمکە بە (صاحبی حکم)، (نافذ الكلمة) (إمام المتقین) ﴿وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾ (صُلَحا)ی (دنیا)و (دین)، (إجرا)ی (عدالەت) بکەم، (رسالەت) و (ملایەتی) لەگەڵ بێ دەسەلاتی، هیچ نیە، بێ (ثمرە)یە ﴿وَاجْعَلْ لِي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ﴾ (ذکر)ی (جمیل). (حقیقةً) ئەوەش (حیات)ێکی زۆر خۆشە، (حتّی) گەلێ کەس (إیمان)یشی نیە، (أما) بۆ (بقا)ی ناوی شتی چاك و بە (نفع) ئەکات. (فی الواقع) هیچ (ملّەت)ێ نیە، ناوی بە چاکە نەیەنێ. هەم لەبەر چاکی خۆی، هەم (جدّی) (أعلا)ی هەردوو (شعب)ە، (إسماعیلی) و (إسرائیلی) (مع الاسف) (سیّئات)ی (بشری) ئەوەش تێك دا، گەلێ (ذاتی) زۆر گەورە، زۆر باش هەن ناویان بە خراپە ئەبەن، (إنسان)یش ئاگای لە (أصل)ی (عداوەت)یان نیە، دوایان ئەکەوێ. (ملایانی أتباعی سبکی و عبّادی خۆیان لە علمی إبن تیمیە محروم کرد. دەخیلەکەم بە قسەی ملایان ڕقتان لە ملایان نەبێتەوە. إستفادەیان لێ بکەن، ئەگەر قسەی خراپیان بوو، (ردّ)ی کەن، ئی باش قبوڵ بکەن، فرقی ملاو ملا

مەکەن ﴿ وَاجْعَلْنِي مِنْ وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ﴾ (وراثەت)ی (معنوی) (تأثیر)م تێ نەکات، (دەوڵەت)ی (دنیا) (نقص)م پێ نەدا ﴿ وَاغْفِرْ لِأَبِي﴾ (تأویل)ی بەمام هەڵناگرێ ﴿ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الضَّالِّينَ﴾ (بینه) (تأثیری) تێ کردیە، بە (رحمەت) پاکی کەوە، ستری کەی، تەوفیقی دەی بۆ إیمان. دیارە (عَلی کَوْنِهِ ضالاً وکافراً) لێ ی خۆش بە، داخلی جنّەتی کە، (مراد) نیە. ئەڵێن: "(إمامی نووی) لە (شرحی مسلم) فەرموویەتی: " لێ خۆش نەبوونی (مشرك)، (خاصّ)ی ئەو (أمّەت)ەیە" (أمّا) قسەیە بێ (معنا)یە، لە (نووی) ناوەشێتەوە (أنبیای عظام) (اوّل) (دەعوەت)یان بۆ توحیدە، بەڵێ ئەگەر بفەرموێ: "(بعض)ە شت لە (أمّەت)ەکانی تر لەبەر کەم (إنکشاف)ی، (لوازم)ی (واجب الوجود)و (مجرّد)و (واحد)ی (حقیقی)، (قبول) ئەکرا، لەو (أمّەت)ە (قبول) ناکرێ (قبول) دارەم! ﴿ وَلَا تُخْزِنِي﴾ بە (إهانە)ی بابم سووکم مەکە، یا (مخجول)م مەکە لە (خزا)یە بە (معنا) (حیا)یە ﴿ يَوْمَ يُبْعَثُونَ﴾ (أنام) ﴿ يَوْمَ لَا يَنْفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ﴾ (أحداً) (ولَو) من کوڕی بابم بم، ئەگەر (إیمان)ی نەبێ، (فائدە)ی نیە ﴿ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ ئەوی بە (إیمان)و دڵێ بێ (مرض)ی (أخلاق)ی (سیّئە) بچێتە خزمەتی خوای، (توجّە)ی بۆ لای وی بێ، (نفع) لە هەموو شتی ئەبینێ ﴿ وَأُزْلِفَتِ الْجَنَّةُ﴾ نێزیك کرا ﴿ لِلْمُتَّقِينَ﴾ بە تەماشاکردنی گوشاد ئەبن ﴿ وَبُرِّزَتِ الْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ﴾ گومڕاهان، بە دیتنی (منقبض) ئەبن. ئەمڕۆ لە کوێن؟ (لزوم)ی نیە، (دنیا) وەکی جاران نیە، لەناو (فلك)ی (محصور) بێ (فضا)یە (واسع)ە، (إلی ماشاء) جێی هەزار بەهەشت وجهنّم لێ ئەبیتەوە، ﴿ وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ﴾ لە کوێن؟ ئەو (إله)ی ئەتان پەرستن! ﴿ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ دیار نین تکاتان بۆ بکەن ﴿ هَلْ يَنْصُرُونَكُمْ﴾ یاردەمیتان ئەکەن، لە (جهنّم) (نجات)تان ئەدەن؟ ﴿ أَوْ يَنْتَصِرُونَ﴾ لە خۆیان (دفع)ی (عذاب) ئەکەن؟ ﴿ فَكُبْكِبُوا فِيهَا هُمْ﴾ (إله)کان، بەسەر ڕوو فڕێدرانە ناو (جهنّم) ﴿ وَالْغَاوُونَ﴾ ئەوانی (جهنّم)یان بۆ (إبراز) کرابوو. (أمّا) (رؤسا)ی (عقلا)ی (ملیّون) نۆرن، إغوای عباد ئەکەن ئەبنە (شفیع) و ناصری مریدەکانیان ضالیان ئەکەن

بەهەشتیان پێ ئەفرۆشن عهدیان لەگەڵ ئەکەن. بێ وان نەچنە (جنّة)، وەچوونی وان بۆ (جنّة) (قطعی)یە، (داخل)ی چین بکەین؟ ﴿ وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ﴾ ئەوان و (غیر)ی وان ﴿ قَالُوا وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ﴾ (ضالّ)و (مضلّ) ﴿ تَاللَّهِ إِنْ كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾ ئاشکرایە، منداڵیش ئەیزانی وانیە ﴿ إِذْ نُسَوِّيكُمْ بِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (أمّا) (مُتَشَيِّخ)ەکان بە (تسویە) (راضی) نین، بەوەندە (عبادەت)ی خوا لە سەری دانابن، قایل نین. ئەبێ ئەوان بە گەلێ زیاتر بپەرسترێن، ئەبێ وا حسابم کەی خوا (أمر) بەری وانە ﴿ وَمَا أَضَلَّنَا إِلَّا الْمُجْرِمُونَ﴾ ئێمە بە چاکیان تێ ئەگەیشتین، (أولیاء الله)، (أحباء الله)، (أبناء الله)، (وسطاء الله)، (إمام الله)، ئەوی بیانەوێ، خواش ئەیەوێ. ئەوێ گوناهکارێ (إبلیس)ی پڕ (تلبیس) لەمیان گۆڕی ﴿ فَمَا لَنَا مِنْ شَافِعِينَ﴾ کەسنیە، تکامان بۆ بکا ﴿ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ﴾ (شفیق) بەزەیی پێمان دابێ بەڵێ زۆر دۆستی بە (رحم)ی دڵ گەرم، زگی بە (إنسان) بسووتێ، وەکی (مبشّران)ی (قادیان)یان، (بهائی)یان، (رؤسا)ی (طرائق)آن، گەلێ (متأثر) ئەبن، بۆ (بشر) ڕۆژی (قیامەت) (معذّب)، بێ (دین)، ئەگرین. (إعتقاد)ت ئەخەنە سەر (أمور)ی مایەی (نجات)، جا ئەبێ خوای بخەیە ناو زگی کچە جوێ، ببێ بە منداڵ وەبێتەدەر، وەکی (فرخ)ەی (حیوانات)، گەورە بێ، خۆی بکا بە (فدیە) گۆی یا ئەویش بەزەیی بە (بشر) داهاتوە، (معذّب) بووین، بوە (فدیە) (نجات)یان بووە. ئەگەر (عقیدە)ت وابێ، قورتار ئەبێ، وە(إلّا) ئەکەویە ژێر دەستی (شیطان)، (عذاب)ت ئەدا، (عقیدە)ت وابێ، ئەمە (مسیح)ێ تازەیە، (مجدّد)ە (نهایەت) بێ ئەدەبی نەبێ (رسول)ە، خوا رحمی بە عالم کردیە، (رسول)ی (سلام)ی ناردیە، دەك ئەو (رسول)ی (سلامە) بەخێرو (سلامەت)ی نەیە. لەوەتی ئەوهاتوە بە (ملیون) شرورو (فساد) (زیاد)ی کردیە!

ئەمە (وکیل)ێ (قطب)ە، یاخود خۆیەتی، (إدارە)ی (زمین)و (زمان) بە دەستیەتی، (ذرّات)ی (کائنات)، بێ (أمر)و (إدارە)ی وی (حرکە) ناکا، جا بەو

(تسویلات)ی، (سلب)ی (عقل)و (مال) –(نعوذ بالله) –ناموس (ئەکەن). ئەگەر (فقیر) بوو یا وەکی کەر (إستخدام)ی ئەکەن، یا شەقێکی تێهەڵ ئەدەن، وەکی سەگی گڕوو، ئاوارەیی (دنیا) ئەبێ. ئەمە هەموو لە ڕووی (محبەت)و (صداقەت)و دۆستی (بشری) ﴿فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً﴾ (رجوع)ی (إلى الدنيا) ﴿فَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (خالص) بێ (شرك)ی (جلی)و (خفی)، بە (غیر)ی خوای کەسمان نەدەناسی، بەکەس هەڵنەدەخەڵەتاین. (إیمان)م هەیە، بەو (نوع)ەی (جنابی حق) (تصویر)ی فەرموە، وایە، (إیمان)و (عملی صالح) (باقی) (فنّ)و فێڵە، دۆستی چی و (شفیع)ی چی؟ بەهەشت فرۆش (دنیا) کڕ، دوشمنی (إیمان)ی (حقیقی) و (بشریّەت)، دۆستی (میول)ی (فاسدە)و (حبی) (إستیلا) و (رئاسەت)، (إستخدام)ی (إنسان) وەکی (حیوان) ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً﴾ (آیةٌ ایّ) ﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ﴾ لە (قوم)ی (أبراهیم) یا (قوم)ی توو ﴿مُؤْمِنِينَ﴾ (أمّا) (آخر)ی (قوم)ی (رسالەت) پەناە، بە (عمومی) (إیمان)یان هینا ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ (یا عزیز أرحمْنا وأنتَ تَعلَم ما أنا فیە) ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ﴾ هەمووی بە (إنکار)ی (رسالەت)، (بشر) (رسالەت)ی پێ ناوێ، یا (بشر) نابێتە (رسول) ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ﴾ برای (مشفق) ﴿نُوحٌ﴾ (علیە السلام) ﴿أَلَا تَتَّقُونَ﴾ (تقوی)ی خوا ناکەن؟ ﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ﴾ بێ (خیانەت)، بێ (حبّ)ی (رئاسەت)، بێ (میل)ی (فاسد) ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ لە (إعتقادیات) لە (عملیات) ﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ﴾ ناوێرم بڵێم: "(رسالەت)" بابڵێین، "(تبلیغ)و (تعلیم)" ﴿مِنْ أَجْرٍ﴾ هیچم لە ئێوە ناوێ ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ هەر ئەو (أجرم) ئەدا، یا بڵێین: "لەسەرەوی یە" چونکی خۆی ئەفەرموێ: "(علی)" بالە (وعد)ەوەبێ، (واجب)ی (من الغیر) نەبێ ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ بە (کمالی إطمئنان) لە ماڵ و مناڵ و (رئاسەت)ی خۆتان مەترسن، چاوم لێ نیە، (إطاعە)م بکەن، بۆ (سعادەت)ی (دارەین) ﴿قَالُوا﴾ گەورەکان ﴿أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ﴾ (أدنی)یەکان، لەگەڵ ئەوان ئێمە نابینە وەلاش، هەرچەند ئەوانە لەسەر (ملّەت)ی ئێمەن، (أما) (خدمە)ن،

ئێستا ئەبن بە (رفیق)مان؟! وەکی (هندوس)ەکان (قبول) ناکەن، (منبوذ)ەکانیان بێنە ریزی وان، (حتّی) لە (إجرا)ی (شعائری دین) یان . هەر چەند (غاندی) پەلەی ئەکرد، بێ هوودە بوو. ئەوانە (سابقا) بە کاروپیشەی (دەنی) (إشتغال)یان کردیە، نابنە (إنسان)ی تەواو ناگۆڕین (مُنَجّس)ن ﴿قَالَ وَمَا عِلْمِي بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ ئەوی کردوویانە، ئەمن (علم)م پێ نیە، وە(حقّ)م بەسەریانەوە، نیە. (حال)ی (حاضر) (إیمان)یان هینایە، لە (تقوی)و (إطاعە) دان وە(محاسبە)و (معاتبە)یان (عائد)ی من نیە ﴿إِنْ حِسَابُهُمْ إِلاَّ عَلَى رَبِّي لَوْ تَشْعُرُونَ﴾ دیارە (إیمان) (محوی) (سابقیّات) ئەکاتەوە. وەئەوانە لە بێ (شعور)ی ئەو هەنجەتە ئەگرن، وەلە بێ (شعور)ی ئەوانەیان لا (رذیل)ە ﴿وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ هەرچی ببن، گاوان و شوان (کنّاس)و (کنّاف)و (حرف)ی (دنی) —کە بۆ دفعی حاجەت وگوزەران بێ— نقصی نیە، نقص بە شخصەکە نادا ﴿إِنْ أَنَا﴾ من تەنها ﴿إِلاَّ نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ بۆ قوم خصوصیەت نیە ﴿قَالُوا﴾ ئیتر بەسیە، درێژی مەدەرێ ﴿لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَانُوحُ﴾ لە دعوەتی ئێمە ﴿لَتَكُونَنَّ مِنْ الْمَرْجُومِينَ﴾ تووش لە (أرذال)آن، (عَدْ) ئەکەین، سووك و چرووك ئەبی لە ناومال، بەردەبارانت ئەکەین، جوێنت پێ ئەدەین ﴿قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِي كَذَّبُونِ﴾ وەکی خۆت ئەزانی ﴿فَافْتَحْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا﴾ بەکوردی ئەڵێ: "بینمان بکە، لێك بینەوە، ئەو حاڵە دەوامی بێ هوودەیە" ﴿وَنَجِّنِي وَمَنْ مَعِي مِنْ الْمُؤْمِنِينَ﴾ بۆ (عائلە)و (أولاد)یش، هەر (تعرض)ی بۆ (عنوان)ی (إیمان) کردیە، ئەمەیە (حقّ)ی (رسالەت) ﴿فَأَنجَيْنَاهُ وَمَنْ مَعَهُ﴾ لە (إیمان) داران (حسب دعائە) ﴿فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ﴾ پڕ ﴿ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ الْبَاقِينَ﴾ پاش (نجات)ی (مؤمن)آن، ئەوی مانەوەی لە (خارج) (غرق)مان کردن ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ ئێرە (تأیید)ی (مختار)ی (سیّد)و (شیخ الآسلام) ئەکات ئەگەر بڵێن: "طوفان عام بووە" ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ (یا عزیز)و (یا رحیم) (نجات) لە چنگی (قومی بەد) ، (تربیە بەد)، (سیری دزوحین)، خوایە (هلاك)یان کەیت ﴿كَذَّبَتْ عَادٌ﴾ (قوم)ی (هود) بەو ناوە (معروف)ن، وە(قوم)ی

(عاد)یشیان ئەلێنێ ﴿الْمُرْسَلِينَ﴾ ئەوی (تکذیبی) (رسول) بکا (تکذیبی) هەموان ئەکات ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ﴾ برای وان ﴿هُودٌ أَلاَ تَتَّقُونَ﴾ لە خوا ﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ﴾ لە (طرف) (باری) ﴿أَمِينٌ﴾ بۆ (خیانەت)م ساغ و پاکم، لەگەڵتان ڕاستم ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ ئێرە (خەزم)ە، لەگەڵ (زێدە)یی ﴿وَأَطِيعُونِ﴾ بۆ (خوف)و هەڕاس ﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (دعوەت)ی (رسل) بێ (طماع)ە، (محض) بۆ (سعادت)ی (عباد)ە، (أمان) خۆتان لە (صاحب)ی (دعوەت)ان، (كذّاب)و (أبليس) بپارێزن، وەکی ئاش بۆ دانە، بە ئاوی (نعمەت)ی خلقی ئەگەڕێن وەك حاجی ئەڵێ:

" کەوەی گوت شێخی من دەستە گێرم لەلام وابوو،

لەبەر جهل و جەوانی، کە پیر بووم تێ گەیشتم دەستی گرتم،

لەکارو کسب و تحصیلی معانی. بەڵێ شێخ قطبە،

أمّا قطبی ئاشە، بە ئاوو (نعمەت)ی (خلق)ە گەڕانی."

﴿أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ﴾ جێی بلندی با (صفا) هەوادار ﴿آيَةً﴾ (قصر)و (قصور)و کۆشك وسەراو قەلات، کە (علامەت)ێکن لە (فنّ)ی (معماری) بە ئایەت (حساب)ە ﴿تَعْبَثُونَ﴾ خۆ (مشغول) کردن و گەمە بە (دنیا)، بۆ (فخر)و (مباهات). قسەیان لەو (عبث)ە زۆر کردیە، (بعض)ەکی بە (عبث) (حساب)ە ﴿وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ﴾ (على الأرض)ی بکەن، ئەڵێی: مأخذو مجاری" ئەو (تحت الأرض)ی بکەی، ئەڵێ ی: "برکەیێ ئاو" ئێکی ئەڵێ: "قصوری مشیّدە" یەکی ئەڵێ: "حصونی مُحکمە" کەس بەلای (معمل)و کارخانەی (حیاك)و (لباس)ی چاك و (ماکنە)ی ئاوو (سائر)ی جێی (صنایع)دا، ئاڕوا ﴿لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ﴾ وەکی (إنگلیز) و (فرنسە)و (سائری دول)، کاری وا ئەکەن، کە (مخلد) بن، (یعنی من حیث النوع) دیارە (قوم)ێ بە (ثروت)و سامان و جاهو (جلال)و (عاقبەت) ئەندیش بووین ﴿وَإِذَا بَطَشْتُمْ﴾ (قاموس) ئەڵێ: "الأخذُ الشديد في كلِّ شيْء" ﴿بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ﴾ بێ (رأفت)و (رحمەت) ئەی گرن. دیارە (عنود)و (حقود) بووین، بە (شدّەت)ێ زۆر نەبێ، دڵیان دانەکەفتیە ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ بێ

هووده، (ماڵ) له (عمارەت)ی (مباهات)ی (صرف) مەکەن، وابه (تطاول) و (جبَروت) مەبن ﴿وَأَطِيعُونِ﴾ (فیما أدعوکم أليه) ﴿وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُمْ بِمَا تَعْلَمُونَ﴾ له (علم)و (صنايع)و (قوّەت)ی (بدنی) ﴿أَمَدَّكُمْ بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ﴾ به (محض)ی (خلق)و (إيجاد) ولأتتان بەگیاو پووش و پەلأشە، وەك (أستراليا)ی (حيوانات)ی (نافع)ی زۆرە، زۆر چاك تیای بەخێو ئەکرێ، (نباتات) (مبدأ)ی نشری (حیوان)و (إنسان)ە، علمایی (بلاغەت) ئەفەرمون، "تفصیلی بعد الاجماله" بەڵێ: به بێ (نظر) بۆ (ما قبل)ی خۆشه ﴿وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ (طبیعی) جێی وا چراگاهی زۆر ئەبێ، (حاصل)ی وادەرئەکەوێ، (قوم)ێ بووین، به (دەوڵەت) مەندی (صُنعیّ) (طبیعی)، ئەمە (نادر)ە. (آسیا)ی ئێمە (ثروت)ی (طبیعی) هەیە، (علم) و (صناعەت)ی نیه، (أوروپا) (بالعکس)ە، مەگەر (بعد الأنتباه) بگۆڕێ، دەنا هەر ولأتی (ثروت)ی (طبیعی) بووبێ، (ثروت)ی (صناعی) نەبووه. قومەکەی إحتیاجی یان (حس) نەکردیە، (إضطرار)و (محیوری)یان نەدیتیه، (أما) ولأتی (من حیث الطبیعة) (فقیر) بن (محیوراً) (سعی)یان کردیه، به (جدّ جُهد)و کۆشش و لقمه نانێکیان دەست خۆخستیه، (عاقبەت) بەسەر (طبیعەت) (غالب) بووین ﴿إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ هەرچەند (أسبابی) (دوام)تان هەیە، (لکن) (روح)ی (دوام)ی (قوم) (عدالەت)ە (إتباع)ی (قانون)ی (إنتظام)ە، (حسن)ی (سیاسەت)ە لەگەڵ (جوار)، (حسن)ی (معامله) لەگەڵ آیندەو ڕەوەندەو (أرباب)ی (مصالح). (مع الاسف) ئەوەتان نیه، (بالعکس) (ظالم)ن (حیارن) ﴿قَالُوا﴾ (قوم): ﴿سَوَاءٌ عَلَيْنَا﴾ یەکسانه (فرق)ی نیه ﴿أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُنْ مِنَ الْوَاعِظِينَ﴾ (إیمان)ت پێ نایەنین به قسەت ناکەین، ئەوەی (ظا)لە(ت)ێ (دغم) ئەکا، لام (محتاج)ی (وعظ)و (نصیحەت)ە، بێ (لطافەت)ە، دووره له (ذوق) وله (قاعده). لازم نیه ئەوەی له (موثوق بِه) (نقل) کرا، (قبول) کرێ، وە(إلاّ) (صحاب)ان (قرائەت)ی (مثل)ی (إبن مسعود)یان فڕێ نەدەدا. (رضوانی خوایان لێ بێ)، ئەوان (قران)ی (منقّح)یان بۆ (تحریر) کردین، (لکن) (عُشّاق)ی (نقل) پڕیان کردەوە،

لە دەغیلە ﴿إِنْ هَذَا﴾ (إشارە) بۆ چی ئەكەی، ئەبێ ﴿إِلاَّ خُلُقُ الأَوَّلِينَ﴾ بە (ضَمَّتَيْن)یانە (فتحە)و (سكون) (مناسب)ی (مُشارُ أليە) بێ ﴿وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾ وەكی (آبا)و (أجداد)مان، كوویان گوزەران كرد، وا گوزەران ئەكەین، كوو مردن، وا ئەمرین. زیندوویبوونەوە، (حساب) و (كتاب)و (عذاب)و (عقاب): یۆك (نیە) ﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ هەندە نەچوو ﴿فَأَهْلَكْنَاهُمْ﴾ واخۆشە. یەكی پاش (٢٠) ساڵ (آفەت)ێكی بێتەسەر، بڵێین: "ئەمە كو (همّەت)ی (شێخ)ە؟ خۆی نیە، دەم ودەست، دەست وپست!" ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ ئەوانی (موالی) ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ (يا عزيز)و (يا رحيم). (يا جواد) و (يا كريم): (إرْحَمْنا وجُدْ عَلَنا بسَعادة الدارَين وأهْلك أعدائنا، فإنّا مؤمنون) ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ﴾ (قبيلە)ی (ثمود)، (قوم)ی نا (صالح) ﴿الْمُرْسَلِينَ﴾ گشتیان ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَالِحٌ﴾ (عليە السلام) ﴿أَلاَ تَتَّقُونَ﴾ وەكی (رسول)ەكانی دی ئەفەرموێ: ﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ، فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُون، وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (والله لا يُضيعُ أجرَ المرسلين) ﴿أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَاهُنَا آمِنِينَ﴾ لەوێ، لێرانە؟ (رأی)یە ﴿فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ باغات و كانیاو، بە (سلامەت)ی (ترك) ئەكرێن؟ (بالهناء والعافية) گوزەران ئەكەن؟ ئەڵێن: (ثمود) لە (ثَمَد)ە، (بمعنی) ئاوی كەم، یا ئاوی بە هاوین، هیشك بێ" ئێمە كۆراوی پێ ئەڵێین. (أصل)ی (معنی) لەگەڵ (جنّات) و (عیون) رێك ناكەوێ ﴿وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ﴾ دار خورما ﴿طَلْعُهَا هَضِيمٌ﴾ لێك نێزیكن، (یعنی) بەری زۆر دەر ئەكا ئەو (طلع)ی كە وشی خورمای لێ دێتەدەر، (متعدّد)ە. ئەگەر بۆ قەسپ وخورمای بەیەوە، بە (معنی) گەیی، ئەو (وەقت)ی (مجان)ەكی ئەوێ. هەرچەند (بعض)ە قەسپ هەیە، ناوكی زۆر (ضعیف)ە، وەك هەناری بێ هێسكی ئێمە، (أمّا) ئەو (نوع)ە كەمە ﴿وَتَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا﴾ هەڵی ئەكەنن، لەبەردی ئەی تراشن ﴿فَارِهِينَ﴾ بە (نشاط) وەك لە گڵی هەڵ كەنن، پێوە ماندی نابن ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ ئی من ﴿وَلاَ تُطِيعُوا أَمْرَ الْمُسْرِفِينَ﴾ ئەوانی (خائن)ن، (مسرف) ئەوەیە چاكە نەكا ﴿الَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي

الأَرْض﴾ لە نێ خۆیان، لە (جوان)یان ﴿وَلاَ یُصْلِحُونَ﴾ (بوَجْهٍ) وەکی ئەلّێن: (دز بازاری اشفته میخواهد.) ﴿قَالُوا إِنَّمَا أَنْتَ مِنْ الْمُسَحَّرِينَ﴾ (سحر)ت لێ کراوە، (عقلّت) تێك چووە ﴿مَا أَنْتَ إِلاَّ بَشَرٌ مِثْلُنَا﴾ بۆ زێدە لە ئێمە، توو بووی بە (رسول)ی خودا؟ ﴿فَأْتِ بِآيَةٍ﴾ (علامەت) و (دلالەت) لە ڕاستیت بکا ﴿إِنْ كُنْتَ مِنْ الصَّادِقِينَ﴾ کەسێ لە (طرف) خوا بنێردرێ، ئەبێ (علامەت)ەکی (عظیم)ی هەبێ، لە (دَعْوا)ی بوەشێتەوە. (حقیقةً) (طلب)ی (آیة) شتێ باشە، (لازم)ە، وە (إلا) (رسالەت) ئەبێتە (ملعبە) وەکی ئێستا، تۆینبازی و (تابع)ی (هوا) (مثلا): (قادیانی) ئەوا (إدعا)ی کرد، (آیة)ی چ بوو؟ هیچ، (بعض)ە قسەی پڕوو پووچی، پیرێژنانە! (مقابل)ی ئەو (حکما)ی (طبیعەت) و (کیمیا) و (هندسە) و (هیئەت) ئەو (نُهات)ە (مخترع) انە، ئەبێ (آیة)ی (رسول) چ بێ؟ لە (فوق)ی (طیارە) و (غواصە) و (ئەلکتریك) و (تەلفەن) ، (تەلەفۆن) و (رادیۆ)بێ. بەلّێ (آیة)ی (رسل)ی ئێستا، بێ شەرمی و بێ حیای یە! لەسەر (جهل) و ناتەواتی خۆیان، (مقابل)ی ئەو هەموو (عُلما) و (حُکما) و (عُظما) و (نَوابغ) و (عبقری)یانە، کە بە تۆزی پێ یان ناگەن، (دعوا)ی (رسالەت) ئەکەن! ئەوانەن، کورد پێ یان ئەلّێن:" های کەرە، های!"﴿قَالَ: هَذِهِ نَاقَةٌ﴾ (ناقةُ الله)یە. (قادیانی) و (بهائی) ئەبا (آیات)یان (حِمارُ الله) با، بەلّێ خۆیان (آیة)ن، گەرچی قسەی بێ (أدبی) لەمن ناوەشێتەوە، (أمّا) بێ (حیایی) وان (مع الاسف) کەمێ بێ أدبی کردم. ئەو (ناقە)یە ئەبێ (خصوصیەت)ێکی هەبێ، کە پێی ئەلّێن: "ناقة الله" بۆیە گەلێك (حکایەت)یان پێ هەلّبەستوە، بێ (أصل) و (فصل) ﴿لَهَا شِرْبٌ﴾ بە (کسر)ی (شین) بە (فتح)ە هەم (قرائەت)ە، وەبە (ضمە)ش (لوغەت) هاتیە، هەر (سێ) (مصدر)ن، یا هەر یەك (معنا)یە ئەدا، لەویدی جودا. لێرە بە (قدر) و (نصیب) (تفسیر)ی ئەکەنەوە، (خلاصە) ڕۆژێ ئاویان بۆ (ناقە)بێ، بیخواتەوە ﴿وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَعْلُومٍ﴾ ڕۆژێ بۆ ئێوە بێ، ئەگەر ئاویان هەر هەندە بووبێ، (جنات) و (عیون) لە کوێ ئەبێ؟ ئەگەر نێ یەك (عین) یا یەك (بیر)بێ، (ئەو (تقسیم) و (ومزاحە) بۆ؟

(مع أنّه) ئاوی تر ئەگەر هەبێ، با بۆ خۆيان لێ ی بخۆنەوە مەگەر (منع) كرابان. (سيدی الوسی) ئەفەرموێ:"لە كتابی (مجمع البيان) دا ئەڵێ:"(إمامی علی) فەرموويەتی:" ئەو كانيە، (أول) كانی بوو، لە عەردی دەركولی بوو،جنابی حق بۆ (صالح)ی هەڵقولاندبوو"، (أما) تێ ی ناگەم، چی ئەفەرموێ؟ بۆ وا ئەفەرموێ؟ ﴿وَلاَ تَمَسُّوهَا بِسُوءٍ﴾ تخوونی نەكەون، دەستی نەدەنی، بە خراپە، بە لێدان و (غير)ە ﴿فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ (عظمەت)و (سعادەت) و (شقاوەت) و (حقارەت)ی (زمان)، بە (إعتبار)ی (ما فيه)يە ﴿فَعَقَرُوهَا﴾ هەموويان (رأی)يان لەسەر بوە ﴿فَأَصْبَحُوا نَادِمِينَ﴾ لە ترسی (عذاب)، يا (خسارە)ی شير، يا لەسەر نەمانی ئەو (آية)ە (عجايب)ە كە (جلب)ی (أنظار)ی ئەكرد ﴿فَأَخَذَهُمُ الْعَذَابُ﴾ گرتنی (عذاب)ی (موعود) ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ، وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ (يا رحيم) (وقت)ی (تَرحّم)ە ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ الْمُرْسَلِينَ﴾ (أساساً) لەوان نەبوە، ژنی لێ خواستينە، (قرابەت)و (قوميەت)ی پەيابووە ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ: أَخُوهُمْ﴾ (قرابەت) و برايەتی، (مبنا)ی لەسەر (مصاهرە)يە ﴿لُوطٌ: أَلاَ تَتَّقُونَ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ، فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ لەوەی (أمر)تان پێ ئەكەم (نهی)تان لێ ئەكەم ﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (أصل)ی (دعوەت)ی (كلی)ئەمەيە: (خصوصيات) بە (خصوصيات)ی (قوم) ئەگۆرێ ﴿أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنْ الْعَالَمِينَ؟﴾ نابينن، لە (رسل)ەكانی دی، ئەو باسە نەبوو، بە (خاطر) و (خيال)ی (قوم)يان دانەدەهات ديارە (مخترع)بووين، (ممكن)ە لە (كەر) فێر بووين، وا ئەبێ (بعض)ە نێرەكەر (ميل)ی دانی ئەبێ، نێرەكەری تری فێر ئەبن، ئارامی نادەن، ئەگەر (صاحب)ی چارەی نەكا، ئەوەندەی ئەكەونی، ئەی كوژن. (أما) ئەوە زۆر (نادر)ە، ئەڵێن: "بەرازيش نێر لە نێری دێ" رەنگە ئەويش وابێ ﴿وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ﴾ ژن (طبعا) وا (خلق) كرايەوە، (مدار)ی (دوام)ی (نوع)ە، ديارە (طرف)ی دی لەگەڵ نێرە (فرق)ی نيە ﴿بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ﴾ زۆر (ظالم) و (متجاوز) لە

(حد)ی (ظلم)ن، نە تەنها لەوە، لە هەموو (معاصی) بێ ئەندازەن گوناهو (معاصی)ش (أدەب) و (سلوك)ێکی هەیە، کەسێ زۆر بێ (حیا) نەبێ، (رعایەت)ی ئەکا ﴿قَالُوا﴾ ئیتر بەس یە. چیتر (لوم) و (زجر)مان مەکە ﴿لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَالُوطُ﴾ پاش ئەم (إحضار)ە ﴿لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمُخْرَجِينَ﴾ لە دەرکراوان ئەبی، شار بەدەرت ئەکەین ﴿قَالَ﴾ ناتوانم ﴿إِنِّي لِعَمَلِكُمْ مِنَ الْقَالِينَ﴾ لە (باغض)انم، قینم لێ هەڵئەستێ، (لومە)تان ئەکەم، نابێ ئەو کارە پیسە بکەن ﴿رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ﴾ لە شەڕی ﴿فَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ﴾ دیارە هەردوو کچی نەبوە ﴿إِلاَّ عَجُوزًا﴾ پیرە ژنی ماوە ﴿فِي الْغَابِرِينَ﴾ لە بە (هلاك) چووانە (بعد الالتفات) ئەویش بە بەر( عذاب) کەوت و ڕۆیی ﴿ثُمَّ﴾ (بعد نجاتهم) ﴿دَمَّرْنَا الآخَرِينَ﴾ بە (هلاك)مان بردن ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ مَطَرًا﴾ (نوع)ی (غیر)ە (معهود)، نەدیتراو، بەردەباران، بۆمبەردومانی (إلهی) ﴿فَسَاءَ مَطَرُ الْمُنذَرِينَ﴾ بارانی پیس و خراپ ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ ئەوانی (جوان) یا (قوم)ی نا (نجیب) ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ (یا عزیز) و (یارحیم) (بعِزَّتِكَ وَرَحْمَتِكَ نَسْأَلُكَ النَّصرَ وهلاكَ العَدُوّ) ﴿كَذَّبَ أَصْحَابُ الأَيْكَةِ﴾ چۆمەڵان، (غابات)، جەنگەڵستان، (موقع)ی بەداروبار، تێکچرژای پڕ،(أما) لێك و پێك، ڕێك و پێك (بدیهی)یە، (بدیهی)یە کە ئەڵێن: "ئەوانیش (کَذَّبُوا)" ﴿الْمُرْسَلِينَ﴾ە، (کسائر الغابرین)ە ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ﴾ ناڵێ: (برایان)، وا دەرئەکەوێ، زاوایەتیشی نەبووە ﴿أَلاَ تَتَّقُونَ﴾ (أیْکە) (مدینە)یە (غیر)ی (مدینە)یە، (خلاف)یانە، (أیکە)و (لیکە)لای (إبن جریر) یەکە، لێرەو لە (صاد)ی، (قرائەت)ی (أبوجعفر) و (نافع) و (إبن کثیر) و (إبن عامر)ی: (لَیْکە)یە. (زمخشری) (قبول)ی ئەو (قرائەت)ە ناکا، ئەڵێ: لە (رسم الخط)ی مُصحَف بە غَلَط چووین. وەئەڵێ (لَیْکە) ناوێکە نەبیستراوە غیرە معروفە (سیّدی آلووسی) ئەفەرموێ: "(إنکاری) (زمخشری) (صحەت)ی ئەو (قرائەت)ە، نێزیکە لە (ردّة)" (مع أنە) ئەڵێ: "پێش (زمخشری)، (مبرِّد)" و (إبن قتیبە)، (زجّاج)، (فارس) (نحاس)، (إنکار)یان کردیە، بۆچی ئەوان (لە

(ردّة) نیزیکترنین؟ (إمام)ی (عین)ە دوای (زمخشری) ئەکەوێ. لکن( بیضاوی) شتی تر (إفادە) ئەدا" (لَیْکه) بە (قراءة) دادەنێ، (قراءة)ی وانە (الأیْکة) ە (أصحاب) وای ئەخوێننەوە، بە (لَیْکه) دێتە گوێ، هەردوو (ألف) لە (قراءة) ئەڕۆن، (فتح)ی (الف)ی (أصل)ی ئەخرێتە سەر (لام)، ئەفەرموێ: کتابەتی لێرەو لە (صاد)ی بێ (الف)ە، بە (إتبّاع)ی (رسم الخطّ)ی (مصحف)ە."

(بارکَ اللهُ فیكَ أیّها البیضاوی) ﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ،فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ، وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (خصوص) ﴿أَوْفُوا الْكَيْلَ﴾ بە تەواوی، بە (نقصان)ی مەپێوون ﴿وَلاَ تَكُونُوا مِنْ الْمُخْسِرِينَ، وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ﴾ (ضرر) بە (خلق)ی مەگەیەنن، بۆ خۆتان تواو و بۆ (خلق)ی (ناقص) ﴿وَلاَ تَبْخَسُوا النَّاسَ﴾ هەرکێ بێ ﴿أَشْيَاءَهُمْ﴾ هەرچی بێ ﴿وَلاَ تَعْثَوْا فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ (عَثو) ئەڵێن: "(فساد)ە، یا (أشدُّ الفساد)ە" (مفسدین) (حالی) (مُؤکدّە)یە، ئەگەر بۆ (آخرەت) بێ، (مُوَسس)ەیە، نازانم بە کوردی بڵێم: "چی؟" ئەو (ترکیبات)ە لە زوبانی کوردی دانیە ﴿وَاتَّقُوا الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالْجِبِلَّةَ الأَوَّلِينَ﴾ (جِبِلاًّ کَثیراً) ﴿قَالُوا إِنَّمَا أَنْتَ مِنْ الْمُسَحَّرِينَ﴾ گۆڕاوی، لە (سحر) لێ کراوانی ﴿وَمَا أَنْتَ إِلاَّ بَشَرٌ مِثْلُنَا﴾ (رسالەت)ی چی؟ ﴿وَإِنْ نَظُنُّكَ﴾ ئەگەر بڵێین: "عاقڵی" ﴿لَمِنْ الْكَاذِبِينَ﴾ چیە؟ (تهدید)مان ئەکەی. ﴿فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِنْ السَّمَاءِ﴾ پارچە (حجر)ی (سماوی) ﴿إِنْ كُنْتَ مِنْ الصَّادِقِينَ﴾ لە (دعوی)ی (رسالەت)، یا لە (تهدید)ی (بالعذاب) ﴿قَالَ رَبِّي أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ چتان (لایق)ە ئەو ئەیزانی ﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ (دوام)یان کرد، بە (صراحەت) بێ (کنایەت) ﴿فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ الظُّلَّةِ﴾ ڕۆژی چەترو سایەبان، (أنّە) هەورێ وەکی چەتر، لەسەریان هەڵدرابوو بۆ (إستراحەت) چوونە ژێر سێبەری کەچی لێ یان بووە (عذاب)ی (نار)ی (سموم)، (عذاب)ی (هائل) کە خوا ئەفەرموی: ﴿إِنَّهُ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ بە (إعتبار)ی (ما فیە) ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ، وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ (یا عزیز)و وە(یارحیم) بە (حرمەت)ی (رسول)ی (مجتبا)و ئەو (رسل)آنەی کە لەو

(سورەت)ە بەو (نظم)ە (ذكر) كران، (حضرەتی موسی)، (حضرەتی إبراهیم)، (حضرەتی نوح)، (حضرەتی هود) (حضرەتی صالح)، (حضرەتی لوط)، (حضرەتی شعیب)، دەرحەق بە ئێمە (رەحم)ێ، دەر حق بە (كَفَرە)و (فَجَرَە)و (فسقە)، (غضب)و (عذاب)ی (هائل)، بۆ (فاسق)ان (ذلـەت)، بۆ (ضعیف)ان (عزّة)، ئەگەر حالێ وابێ، (علم)و (دین) لەو ولاتە (محو) ئەبێ. خوایە ئەوی بیستمان، ببینین، (محو)ی درزو حیزو (أنصار)یان ﴿وَإِنَّهُ﴾ (قرآنی كریم) ﴿لَتَنْزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ یاخود (بیان)ی (أحوال)ی (رسل) ﴿نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الأَمِينُ﴾ ئەو (بە)ی یە، زۆر جوانە ئی خوایە، لەگەڵ (روح الأمین)" مصاحبەی هەیە ﴿عَلَى قَلْبِكَ﴾ ئەوی بڵێ : (خانَ الأمین)، كێ ئەتوانێ بڵێ: "لە فرقەی مسڵمانانە؟" (یعنی) (جبریل)ی (أمین) (روح)ێكی خاوێن، (قورئان)ی هێناوە ئەوەی كە (بالواسطە) بۆ (رسولی أكرم) هاتبێ، بە (لفظ) خوێندیتەوە، بە (طریقە)ی (سمع) چۆتە دەروونی (هُمایون)ی (قلب)ی (مبارك)ی چاكی تێ گەیشتیە، (ظریف)ی (حفظ) كردیە، لەو (نزول)ە (قطعیاً) (ملابسە)و (ملامسە) (مداخلە)و (مقارنە)و (مقاربە)ی (جنّ)و (إنس)و (شیطان)ی تیانیە. وەك لە (بخاری) (إشارە)ی بۆ ئەفەرموێ (بعضاً): وەكی (صلصلە)ی جرس بۆی هاتوە) دیارە (رأساً) لە (طرف) (كبریائی) (إلقا)ی (سمع)و (قلب)ی (رسولی أمین) كراوە، (وكذلك) (مداخلە)ی خیاڵی نیە (ولو) (كلام) بە (طریق)ی (دماغ) بۆ (قلب) ئەچێ، (أمّا) (أساساً) (رسولی أكرم) بەدەماغی نەدەهات، ببێتە (رسول)، وەك (خیالیّون)نان، (إحضارات)ی بۆ بكا. (حتّی) (جنابی رسول) (وقت)ی (نزول)ی (وحی) لە (طریق)ی (حواس) (إنقطاع)ی ئەبوو، تا (وحی) (إلهی) لە هەموو (أغلاط)و (أخلاط)ی (حواسّی) (مُنزَّە) بێ. (محل)ی (عقڵ) (دەماغ)ە، یا(قلب)ە؟ (خلافی)یە، (ظاهر) لە (طرف) (قلب)یانە، بە (یقین) (زحمەت)ە بە (قطع)ی (علم)و (عقل) بێ وان نابێ، (مركز) كامیانە؟ (جذم)ی (مطلق) (مشكل)ە. (حكما)ی (جدید) (دماغ) ئەكەنە (محلّ)ی (عقڵ) ئەویش دووە: (عقڵی باطن) و (عقڵی واعی)، دڵ دەكەنە محلی (عواطف). (جنابی

سیّدی الوسی) صاحبی (روح المعانی) لێرە (تفصیلاتی) (غریب)ی هەیە، شایانی (مطالعە)یە بە (شرط)ی (فهم) کردن، (نقل)ی لە (بعض)ی (أهل)ی (حکمەت) ئەکا، لام وایە (ملا صدری شیرازی) یە، (أمّا) سەراپای (خیالیّات)ە ﴿لِتَكُونَ مِنْ الْمُنذِرِينَ﴾ (نزول)ەکە، یا (إنذار)ەکە ﴿بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُبِينٍ﴾ بێ (تعقید)، (سریع الفهم)، خۆش (أدی) ﴿وَإِنَّهُ لَفِي زُبُرِ الأَوَّلِينَ﴾ (ذکر)ی (قورآن) لە (کتب)ی (رسل)ی (سابقە)دا هەیە، (معنی)ی ئەوە نیە (قورئان) هەمووی لەناو (کتب)ی (أنبیا)یان بووە، خوا (ترجمە)ی کرد، بە (عربی). بەڵێ گەلێ قسەی تیایە، ئی (کافر) ،ئی (مؤمن)، ئی (إنسان)، ئی (مَلَك)، ئی (رسول)، ئی (شیطان)، ئی (طیر)، ئی مێروو. دیارە بەو (عبارەت)ە کە لە (قورئان) دایە، (تلفظ)یان پێ نەکردیە. ئەگەر (إمامی حنفی) بەو (آیة)ە (إستدلال) بکا لەسەر جوان)ی (قرائەت)ی (قورئان) بە (فارس)و (تورکی)و (هندی)و سائری (لغات)، (حقیقةً) (إستدلال)ی خۆی نیە. (لاشك) ئەو عبارەتی، تعبیری پێ لە (معنا)ی ئەدرێتەوە، (قورئان) نیە.

من بۆ تێگەیشتنی أجانب، ترجمەی (قورئان) إنکار ناکەم، بەڵکو زۆر بە فائدەیە، لکن نەڵێن: "ئەمە (قورئان)ە" وەکی (تورات)و (إنجیل) بە هەر (لغەت)ی بێ، (کتابی مقدّس)ە، (تورات)ە (إنجیل)ە.

ئارەزووم ئەکرد جمعێ لە علمای عەرەبی و زوبانزان و کاتب و محرری غایەت بە قوّەت بە جزالەتی عبارەتی وەکی (جلال نوری) و (طه حسین ) ، (فکری إباضة) (قورئان)یان بە (عبارەت)ی جوان، خۆش (أدی)، (سهل الفهم) ترجمەیان کردبا، زۆر بە (فائدە) ئەبوو. ئێستا بڵێین: "دروستە، دروست نیە" (ترجمە) کرا بە (لسان)ی (مختلفە). ئەوانی (ترجمە)یان کردیە، وا دەرئەکەوێ زۆر لە (أرباب)ی (قلم) نەبووین، (معلوم) (أجانب) (تدخلات)ی تیا ئەکەن، (روح)یان (أمین) نیە (ترجمە)ی بە (تورکی) کراوە، زۆر بێ (تام)ە، لام خیانەتێکی تیایە ئەگەر چی وائەنوێنن، بۆ ئاسانی، تێگەیشتنی (عوام) وامان (ترجمە) کردیە. (قورئان) (ترجمە) بکرێ، لەگەڵ (محافظە)ی (أصل)ی وەکی

(إنگلیز) کردوویانە، (صفحە)یە (قورئان)ە، (صفحە)یە (ترجمە)یە، جوانە ﴿أَوَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ آيَةً﴾ چما بۆ وان (آیة) نیە؟ ﴿أَنْ يَعْلَمَهُ عُلَمَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ ئەوانی (حبرە) باشەکانی بێ (غلّ)و (غش). زانیان (حق)ە،(موافق)ی (بشارەت)ی (رسل)ە، ئیمانیان هینا. جا بنۆڕە (إختلافات)ی (ترکیب)ی (نحوی)، (یَجوزْ)، (یَجوزُ) (إنسان) سەرەدەری پێ ناکرێ! ﴿وَلَوْ نَزَّلْنَاهُ عَلَى بَعْضِ الأَعْجَمِينَ﴾ کە چ (رقابەت)و (قرابەت)یان نەبێ، کە (علی الأکثر) (قوم) (تابع)ی (غیر) ئەبن ﴿فَقَرَأَهُ عَلَيْهِمْ﴾ (قرآن)یان بەسەردا بخوونێتەوە ﴿مَا كَانُوا بِهِ مُؤْمِنِينَ﴾ (إیمان) بە (قورآن) نایەنن لەگەڵ (مزاج)و (مشرب)یان ڕێك ناکەوێ، وەکی (عالم)ی ئێستا (ئاورووپایی) هیچ، (آسیایی)ش تێك چووین. لەگەڵ (مزایا)و (شرف)و (فضائل)ی (قورآنی) (قط، قط) ڕێك ناکەون، (میل)یان بۆ ناچێ. (بعض)ی قسەی (بهیمانی) لێرە وتراو، خۆزی (ئالووسی) (نقل) نەکردبایە ﴿كَذَلِكَ سَلَكْنَاهُ فِي قُلُوبِ الْمُجْرِمِينَ﴾ بە (وجە)ی (تکذیب) نەبێ، (تصوّر)ی ناکەن، ناچێتە گوێیان، (فضل) لە دڵیان، (إلاّ) لەگەڵ (شك) و (ریب) و (إفك)و (إفترا)و (إختلاق)و (أساطیر). ئەگەر (قورآن) بە (بلاغەت)و (أعجاز)و (حِکَم) و (معارف)ی بچێتە ناو دڵیان، (مجبوراً) (إیمان) ئێنن. (لکن) ئەوەنایەتە دڵی من، (ولو) (مختار)ی (محقّقین)آن بێ، دیارە (علّەت) (جرم)ە، (کفر)و (إیمان) هەرچی (کیفیّات)ی (نفسیە) بێ، کە (رسوخ)ی بەست، ئەوجا (جنابی حق) بە گوێرەی (سِلك)ە کە بە دوای ئەدا، (معاملە)ی (لایق)ی حاڵی و (شأن)ی لەگەڵ دەکا. لام وایە ئەم (رأی)یە (وسط)ە لە (بین)ی (أشاعرە)و (معتزل)ە ﴿لاَ يُؤْمِنُونَ بِهِ﴾ خۆت بە (هلاك) مەدە (تأسّف) مەخۆ، (محقّق) بزانە، (إیمان) بە (قرآن) نایەنن ﴿حَتَّى يَرَوُا الْعَذَابَ الأَلِيمَ﴾ ئەگەر (عذاب) (عذاب)ی (تأدیبی) بێ باشە، وە(إلاّ) (محو)ە ﴿فَيَأْتِيَهُمْ﴾ (عذاب) ﴿بَغْتَةً﴾ ناگەهانی ﴿وَهُمْ لاَ يَشْعُرُونَ﴾ ئاگایان لەخۆ نیە ﴿فَيَقُولُوا﴾ کە دییان ﴿هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ﴾ (تأخیر) ئەکرێین، ئەوجارە (عَذاب)مان لەسەر هەڵ ئەگیرێ ئیتر تۆبە ئەکەین (إیمان) ئێنین! ﴿أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ﴾ بە (وجە)ی (إستهزاء)و

(تکذیب) ئەیان گوت: (بابێ، بابەردە باران کرێین) ئەواهات، چی ئەکەن؟! چارەیان چیە؟ نیە ﴿أَفَرَأَيْتَ﴾ ئەڵێین: "فَأَخْبِر" پێیان بڵێ، (خبر)یان دەیە ﴿إِنْ مَتَّعْنَاهُمْ سِنِينَ﴾ (مدّة)یە زۆر، تا ئەگەنە (عمر)ی (طبیعی) لەگەڵ گوزەرانێ خۆش ﴿ثُمَّ جَاءَهُمْ مَا كَانُوا يُوعَدُونَ﴾ ئەو (عذب)ی (وعد)یان پێ ئەدرایە ﴿مَا أَغْنَى عَنْهُمْ مَا كَانُوا يُمَتَّعُونَ﴾ لەو (مهلەت)و (تمتّع)ە، چ (فائدە)یە، ئەبینن؟

نازانم لەگەڵ ئەم (مەلا)یانە چ بکەم؟ (موصوفە)یە، (نافیە)یە، (مصدریە)یە، (موصولە)یە، (رابط)ی (مَحذوف)ە؟ کوردی لە کوێ؟ ئەو (تفنّن)ە لە کوێ؟ (زەحمەت)ە! (ظاهری) ئەو (عذاب)و (إستفهام)و (خبر)ە لە (دنیا)یە. (بعض)ی (اوّل)ی ئەبەن بۆ (قیامەت)، (رابط)ە تێك ئەدەن، (رحمەت)یان لێ بێ، (لسان)ی (عربی)ش هەڵ ئەگرێ. (لکن) (صیانەت)ی (نظم)و (جزالت)ی (لفظ)و (معنا)ی (قرئان)یش (واجب)ە ﴿وَمَا أَهْلَكْنَا مِنْ قَرْيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ﴾ (إنذار)یان کردینە، (إیمان)یان نەهینایە، بە (هلاك) چووین. (مراجعە)ی (ترکیب)ی (نحوی)کە، (ممکن)ە گەلێ (قریە) پاش چەند (منذر) وێران بووبێ، یاخود غیری (رسول)یش لە پیاوە (عاقل)ان و بە (شرف)و (ناموس)ان (إنذار) یان کردینە، دوایە (رسول)یش هاتینە. ﴿ذِكْرَى﴾ (وعظ)و (إعتبار) بۆ (غیر) و دوای وان. تا (قوم)ێ دی، (تکذیب)ی (رسول) نەکەن.

(ترکیبات)ی زۆریان بۆ (ذکری) کردیە، چ بکەم کوردیە، ئەو (تراکیب)ە هەڵناگرێ ﴿وَمَا كُنَّا ظَالِمِينَ﴾ لە (إهلاك)یان بەڵکو (عین)ی (عدالەت)ە، خوایە بینوێنی! ﴿وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ﴾ بە(قرآن) ﴿الشَّيَاطِينُ﴾ (مصون)ە (تنزیل)ی (ربّ العالمین)، (نزل بە الروح الامین) لە (مقاربە)ی (شیطانی لعین) ﴿وَمَا يَنْبَغِي لَهُمْ﴾ (مناسبە)ی نیە لەگەڵیان، (شأن)ی وان و (هدایەت) و (علم)و (حکمەت)ی (قورئان) لێك دوورن ﴿وَمَا يَسْتَطِيعُونَ﴾ ناتوانن، ئەدی ئەو (شیطانە رجیم)ە، کوو توانی، لە (بین)ی دوو لێوی (رسول اللە) ئەو (هذیانە)ی دەڵێن، بیڵێ؟! (حاشا)، هەڵبەستی (شیاطین الإنس)ە ﴿إِنَّهُمْ عَنِ السَّمْعِ

لَمَعْزُولُونَ﴾ نـاتوانن گـوێ ڕاگـرن کـە (وحـی) بـۆ (رسـول الله)ی دێ، لەبـەر (سطوەت)ی (إلهی)و (هیبـەت)ی (ملـك)، (شـیطان) لەبـەر دەنگـی بـانگ دانـێ هەڵێ، کوو ئەتوانێ (مداخلە)ی (وحی) بکات؟ (ممکـن)ە بڵـێین: "ئـەو (قـوم)ە لـە بیـستنی (قورئـان) دوور بـوون، بـێ گـوێ بـوون، (أنّـە) نـای بیـەن، بۆیـە (إیمان)ی پێ نایەنن" ﴿فَلاَ تَدْعُ مَعَ اللهِ إِلَهًا آخَرَ﴾ (دعوەت)ت هەر بۆ وی بێ، خالّی لە (شائبەی شرك) ﴿فَتَكُونَ مِنَ الْمُعَذَّبِينَ﴾ (العیاذ باللە) نەکـەی میلـی بکەی (ولو) (إدارە) (سیاسةً) بێ ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ﴾ (فضل) لەوەی کە بۆ (خـاطر)ی وان (میـل)ێکـی بکـەی. (لازم) نیـە، ئـەوە لـە (مکّـی) بـێ یـا لـە (مدینی) بێ، یا خزمی (مسلّمان) بن، (فی الحقیقه) (عربی) (لغەت)ی (واسـع)ە، آن زیادە، لە ناوی (أعضا)و (أجـزا)ی (حیـوان)و (إنـسان). ئـەمن زۆر (تعجّـب) ئەکەم، ئەڵێ ی: (تشریح الابدان)یـان زانیـوە، بـەو گـوێرە ناویـان دانـاوە، ئـەو (دقّەت)ە لە (بداوەت) ناوەشێتەوە ئێمە ناوی (عشیرەت) (حتّـی) (طائفـة)مـان نیە. (عـرب) (اوّل)ی (شـعب)ە، لـەوی بـەرەژێر (قبیلـە)یـە، ثـمّ (العمـارة)، ثـم (البطن) ثم (الفخـذ)، ثـم (الفـصیلة). (بعـض)ێ ئەفـەرموون: "عـشیرەت پـێش فصیلەیە" (سبحان الله) ئێـرەش لـە (إخـتلاف)ی (علمـا)و (نـسّاب)ان (خـالّی) نـەبوو ﴿وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ﴾ باڵـت شـۆڕکە ﴿لِمَنْ اتَّبَعَكَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ﴾ بـاڵی (رأفـت)، بـاڵی (تواضـع)، بـاڵی (حمایـەت)و (صـیانەت)، (حـق)ی (رسـالەت) ئەمەیـە. بـۆ (عـشیرەت)ی (أقـرب) (إنـذار)، بـۆ (تبعـە)ی (مـؤمن) (لطـف)و (مرحمەت)و (لین)ی (جانب) ﴿فَإِنْ عَصَوْكَ﴾ ئەوانەی (إنذار)یان ئەکـەی ﴿فَقُلْ إِنِّي بَرِيءٌ مِمَّا تَعْمَلُونَ﴾ بۆ (مـؤمن)ی (عاصـی) وانـا گـوترێ، (تبـرا)ی لێ بکـا، (ولو) (أقـرب النـاس) بـی، (إعانـە)ی لەسـەر بـدەی؟ مـەدە، (مسامحە) مەکـە ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ﴾ لەسەر (عاصی) (عزّەت) بنوێنە، بۆ (مطیـع) بـە (مرحمەت) بە ﴿الَّذِي يَرَاكَ﴾ (ملحوظ)ی (عـین)ی (عفایـەت)ی، ئـەتبینێ ﴿حِينَ تَقُومُ﴾ (ظاهر) وایە، بۆ شەو نوێژ بێ ﴿وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ﴾ (عِبـاد الـرَحمن الذينَ يبيتون لِربِّهم سُجَداً وقيِاما) (تقلّب)ی (فی الأنبیـاء) (وفی الأصـلاب) جـێی

نیە، گەلێ (تقلّبات)یان لەو (تقلّب)ە داهەیە ﴿إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ ئەزانێ چی ئەڵێن، ئەزانێ چی ئەکەن، (ظاهر)و (باطن) (کلّی) و (جزءی) لێ ی بزر نابێ ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَنْ تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ﴾ (رابطە)ی زۆر (ظاهرە)، ئەبێ (حسن) لێرەش (شیاطون)ی خویندبیتەوە؟ هەرایان بوو، لەسەر (قرائەت)ی (حسن) لەسەر (آیة)ی (سابق). بە (لعنەت) بن (شیاطین)، پیاوێ وەکی (حسن): (بلیغ) و (فصیح)و (ملیح بیان) تووش (لحن) ئەکەن، خۆیانی لێ ئەگۆڕن، خۆیان ئەکەن بە (شیاطون)! (ذاتاً) (أصلی) (شیطان) (مجهول)ە، لە (شیط)ە، یا لە (شطن)ە؟ ﴿تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ﴾ زۆر درۆزن وگوناه کارو رووڕەش، بێ (مناسبە) نابێ، ئەوی پاك، لە (طرف) پاکان (وحی) بۆ دێ، ئەوی بەد بێ، لەلای بەدان! قەل لەگەڵ قەلی کۆتر لەگەڵ کۆتری. (حکما) ئەفەرموون: "(مناسبە) لە (بین)ی (علّەت)و (معلول) (شرط)ە، (حتی) (روح) بە (مناسبە) (تعلّق) بە (بدن) ئەبەستێ، (روح)ی ئەو (بدن)ە (مناسبە)ی لەگەڵ (بدەن)ێ تر نیە." جا بە (إنصاف) تەماشای (رسالەت پەناه) کەن وەخۆتان ئەیناسن، قسەکانی ئەو، وەکی قسەکانی (ئاوروپایی) نین ك (أفّاك)ی (أثیم) هەزار درۆو دەلەسەی نالایەق، بێ (معنا) بێ (مناسبە)، (خلاف)ی (حقائق)ی (ثابتە)ی (تأریخیە) دەر (حەق) (جەنابی رسالەت پەناه) هەڵ ئەبەستن، لە (عصر)ی (نور) (عالم) ئەهاوێنە، ناو (ظلمات) ﴿يُلْقُونَ السَّمْعَ﴾ گوێ ئەهاوێن، ڕائەگرن لە (شیطان)ەکان ﴿وَأَكْثَرُهُمْ كَاذِبُونَ﴾ (حتی) لەوەی (إسناد)ی بۆ (شیطان) ئەدەن، ئەو بە ئی وان (راض)ی نیە! (حقاً) (إنسان) ئەمڕۆ تەماشای (سیّئات)ی (بشر) ئەکا، ئەوەندە پیس و نەدوو (دون)ە، (شیطان) لێ ی بەرییە، ئەوەندە (لئیم)و بێ (ناموس) نیە. گەلێ جار ئەڵێم: "ئێوە تەماشای (وجدان)ی خۆتان کەن، (وەقت)ی (حکایەت)ی ئەگێڕیەوە، لەمەیانە، درۆیە دێ، (تجسّم) ئەکا، ئەگەر درۆیەکە نەکەی، قسەکە زۆر بە تام نابێ، ئەگەر ئەو پینەیەی لێ دەی، (غایەت) جوان دێ، ڕەونەقی ئەداتێ ئەگەر خۆت گرت، درۆیەکت نەکرد، جارێ دوو جار، ئەوسا

لەسەر درۆ (غلبە)ی ئەكەی، نای كەی. وائەبێ ئەو (تَجَسّم)ە (زائل) ئەبێ وە(إلاّ) بە دوای درۆیان ئەكەوێ، بەتام بێ تام، ئەوی بێتە سەر زارت نایگێڕیەوە، ئەوجا (إنسان) ئەبێتە (أفّاك)و (كذّاب)! (حكایات)ی (كهنە)ی (عرب) (مشهور)ن، لە (آیة)ی ﴿وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمْ الْغَاوُونَ﴾ دەرئەكەوێ، (مراد) لە (أفّاك)ی (أثیم) (مهبط)ی (وحی) (شیاطون) و(شعرا)ن، دیارە خۆیان (مُضل)ن، (أتباع)یان (ضالّ)ن، گومراهن ﴿أَلَمْ تَرَى﴾ (أیّها الناظر) ﴿أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ﴾ لە (أودیە)ی (قیل)و (قال) ﴿يَهِيمُونَ﴾ (هائم)و (متحیّر)و بێ (مسلك)و بێ (مبدأ) و بێ (غایە) (هتك)ی (أعراض)، (قدح)ی (انساب)،(ذمّ)ی (أشراف) (مدح)ی (أجلاف)، (مبالغات)ی درۆ، بێ ئەنداز ئەكەن.

ئەو (شعرا)یانە بوون، ماڵ و دەوڵەتی (ئەمەوی) و (عەباسی)یان بە قوڕی گرت، (خزینە)ی (حكومەت)یان چۆڵ كرد، سازندگی وەكی (إبراهیم بن إسحاق موصلّی) (میرات)ی (٣) ملیۆن دینار بوو. (إمامی شافعی) بە قەرداری مرد. ئەو (حكومەت)آنە ئەژیەن؟ خۆیان ئەوەندە (رزیل)آنە سفیلانە جووڵانەوە (صنعەت)ی (شعر)یشیان بێ (قیمەت) كرد، ئەمڕۆ (ذات)ەكی (مدح) ئەكەن، سبەی (هجو). (عجایب) لە پیاوە گەورەكان، كوو پێیان خۆش بووە (مدح)یان بكەن؟ ئەیان زانی (مدح)یان بۆ (جلب)ی (مال)ە، نە (بیان)ی (حق)، (خلق)یش ئەی زانی وان. (خلاصە) (سیّئات)ی (شاعر)ان –(خصوص) لە (إسلامەت)ی– نایەتە (تعداد). (أفلاطون) زۆر لە (علیە)ی (شاعر)آنە، آن زیادە ئەوانەی بە خیاڵ (آلهە) (إعتبار) ئەكەن، وەشەڕیان ئەهاوێنە (بین)، ئەفەرموێ: "ئەمە زۆر (خراپ)ە بۆ (عوام)، (آلهە) لە (نظر) وان (مبدأ)ی (سعادەت)و (خیر)ن، كە ئەوان بە شەڕ بێن، ئیكدی بكوژن، (إنسان) ئەبێ چ بكا؟" ﴿وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ﴾ گوێ لە (شێخ رضا) كە كوڕی (شیخ عبدالرحمن)و برای (شیخ علی طالەبانی) چ بە خۆی ئەكا لەگەڵ هەتیوە (بلغاری)، تا ئەچێتە لای (أحمد پاشای بابان) شتەكی بداتێ. (حق الآنصاف) (أحوال)و (أطوار) و (مسلك)و (غایەت)و دعوەتی (محمدی) نسبەتی لەگەڵ

